










# جیهانی فریشتان

وەرگێڕانی

ژیوانی گەلاڵی



بیروباوەڕ لەبەر ڕۆشنایی

قورئان و سوننەتدا

# جیهانی فریشتان

نوسینی

**دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر**

وەرگێڕانی

**ژیوانی گەلاڵی**

زنــجــيرەی: بیروباوەڕ لەبـەر ڕۆشـنایی قورئـان و سوننەتدا
ناوی کتێب بە عارەبی: عالم الملائكة الأبرار
ناوی نوسەر: دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر
نۆرەی چاپ: شەشەم
ساڵی چاپ: ١٤١١ك - ١٩٩١ز
ناوی کتێـب بەکوردی: جیهانی فریشتان
ناوی وەرگێڕ: ژیوانی گەلاڵی
ئەرکی چاپ: پرۆژەی وەرگێڕان
پیتچنین: نووسینگەی تەفسیر بۆ کۆمپیوتەر
نۆرەی چاپ: یەکەم
ساڵی چاپ: ١٤٢٠ك - ٢٠٠٠ز
چاپکردن: چاپخانەی پەروەردە
تــــیراژ: ١٥٠٠
ژمارەی سپاردن: ٥٤ ساڵی ٢٠٠٠

# پێشەکی وەرگێڕان

بیروباوەڕی ئیسلامی بناغەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزە، تا بەهێزتر بێ موسـڵمانێتی بەرهەمدارترو بەرهەمی بەپێزترو پێزی فرەوانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی بـو کـە گـەورەترین وەرچـەرخانی بێوێنـەی خستە مێـژوی مرۆڤایـەتی، مرۆڤایـەتی لـە نشـێوی‌و داڕوخـان و وێرانـی رزگـار کـرد، رەوشـی ستەمئامێزی تارومـار کـرد، دەسـتی رەشـی زۆردارانـی بـڕی، کۆیلـەو چەوسـاوانی رەهاکرد، باڵی بـەزەیی‌و دادگـەری بەسـەر جیـهاندا راهێـڵاو سـەرجەم گـەل و توێـژی خەڵکی لەبەر سێبەرە فێنك و ئارامەکەی هەسایەوە، ئاگری خراپەکاری‌و کوشت وبڕو تالآن و بڕۆ و بەرهەڵدایی‌و بێئابڕویی کوژایـەوە، روحـی مرۆڤپـەروەری‌و رێـزی مـرۆڤ ژیایەوە.

گەشـانەوەی گوڵـی چاکـەکاری‌و خۆشـی‌و دادو رێـزو هێمنـی‌و خۆشـگوزەرانی‌و ئازادی‌و سەربەستی بـەهۆی بیروبـاوەڕی ئیسـلامییەوە دێتـەدی، بـەڵام تەقینـەوەی بورکانی وێرانی‌و خراپەکاری‌و ناخۆشی‌و سـتەم‌و بێـهودەیی‌و نیگـەرانی‌و تاڵگـەردی‌و ژێر دەستەیی‌و کۆیلایەتیش بەهۆی بیروبـاوەڕی نائیسـلامییەوە بـەرپادەبێ، چونکـە هەمویان لەسەرچاوەی هەواو هەوەست و ئاوەزی بەرژەوەندی‌ناسی و هزری کاریگـەر بەدەورووبەرێکی دیاریکراو دێنەکایەوە.

بیروباوەڕ ئەگەر ئیسلامی نـەبێ وێرانـەو وێرانی دەنێتـەوە ئەگـەرچی بانگەشـەی بنیات نان و چاکسازیش بکات. مێژو لەم وێرانکاریانـە سیخناخ بـوە کـە هـەرجارەی بیروبـاوەڕێکی قرپـۆك پـەیدابوەو مرۆڤایـەتی کردۆتـە قوربـانی ، ئـەدی بیروبـاوەڕە سەفسەطیەکەی نەسرانیەکان نەبو کەبەر لەئیسلام و تاکو ئێستاش کێشـەیانە ئـاخۆ (مەسیح) خوایە یان مـرۆڤ! هـەزاران هـەزار مرۆڤـی کـردە قوربـانی‌و سـەدان شـەڕو کوشـتاری درێژخایـەنی نایـەوە؟!، ئـەدی بیروبـاوەڕی ئەستێرەناسـی گـەندەڵی

فیرعەونەکان نەبو کە هەزاران هەزار رەش و روت و هـەژاری کـردە کۆیلـەو بـەبێگاری گاشەبەردە زلەکانی ئەهراماتی پێ دەگواستنەوە؟!، ئەدی بیروبـاوەڕی شـوفێنیزمی ئەوروپا نەبو کە دوجەنگی گەورەی جیهانی بەرپاکرد و بـەملیۆنان مرۆڤیـان کـرد بـە قوربانی؟!، ئەدی هـەر بیروباوەڕە شـەیتانیەکان نیـە کـە وای کـردوە هـەموو رۆژێ بۆمبای ئەتۆمیو هایدرۆجینیو نیوترۆنی بۆ وێرانکردنی مرۆڤایەتیو زەوی وەبەرهـەم بێ؟!

چاك سـازانەوەی رەوشـی مرۆڤایـەتی، رەوینـەوەی ترسـی وێرانـی، گەڕانـــەوەی خۆشیو ئارامی، بەرپاکردنەوەی دادگەری لەسەرتاسەری جیهاندا؛ بەهۆی بزاڤێکـەوە دەبـێ کـە لەسـەر بیروبـاوەڕێکی پـاك و بێگـەرد دامـەزرا بـێو لـەقورئان و سـوننەت هەڵێنجرا بێ، ئەگەر نا هەر وێرانی لەناو وێرانی بەرپادەبێو مرۆڤایەتی وێرانتر دەبێ.

بیروبـاوەڕی ئیسـلامی کاریگـەرێکی قـوڵ و گـەورەی لـەخۆ گرتـوە، کاریگـەرێکی ئەوتۆ کە ئەگەر مرۆڤ هەرچـەندی تاوانکـارو دڵـڕەق و بێبـەزەییو وێرانکـاریش بـێ، سەرلەبەری کیانی ئەم مرۆڤە دەگۆڕێت، گۆڕانێك هەمو لایەنەکانی بگرێتەوە، چونکە بیروباوەڕی ئیسلامی چارەسەرو ئامۆژەکانی بۆ رەگ و ریشاڵی مرۆڤە، هـزرو ئـاوەزو دەرونـی رێـك دەخاتـەوەو تـەپ و تـۆزی شـەیتان و هەوەسـت و خۆپـەرستی لەسـەر دەرونی لادەدات و پاکی دەکاتـەوە، ئـەمجار رێوشـوێنێکی راسـتاڵی بـۆ رادەنوێنـێو پێی دەڵێ فەرمو ئەمەش ژیانی خۆشبەخت و بێوێنەو نمونەیی.

هەر نوسەرێکی موسڵمان لەهەر دەرگایەکەوە چوبێتە نێو ئەم بیروبـاوەڕەوە یـان لەهـەر گۆشـە نیگایەکـەوە تێـی روانیبـێو خزمـەتێکی پێشکەش کردبـێ و متمانـەی بەسـەرچاوەی بێگـەردو دور لـە خورافـات و شـتی بێهودە کردبـێ، هەڵبـەت کـارێکی گـەورەی ئـەنجام داوەو خزمەتەکـەی بەشـێکە لـەم رزگاربونـە سەرتاسـەریەی کـە مرۆڤایەتی دەمێکە بۆی عەوداڵە. دیارە ئەم زنجیرەیەی کـە دکتـۆر عومـەر سـلێمان ئەشقەر نوسیویەتیو ناوی ناوە ((**العقيدة في ضوء الكتاب والسنة**)) بەشـداربون و خزمەتێکی گەورەی ئەم مەیدانەیـە، کـە متمانـەی کردۆتـە سـەر سـەرچاوەو ژێدەرە

ڕەسەنەکانی بیروباوەڕو بیروباوەڕە پوکەڵ و لاڕێو ناتەواوەکانی لێ داوەشاندوەو پاك و پوختەکەی ڕاگەیاندوە، کە هەڵبەت ئەمە خاڵی هەرە سەرەکیە لەڕانواندنی بیروباوەڕی ئیسلامیدا، ئوسلوبێکی سادەو ڕێك و پێك و زانستیانەی بەکارهێناوە بەتایبەتی لەپەرتوکەکانی دواییدا، ناوەڕۆکی پەرتوکەکەش پڕ ئایەت و فەرمودەو دەقی زانا بەرزەکانی هێناوەتەوەو لەبەرتیشکی ئەم دەقانەوە بیروباوەڕەکەی ڕۆشن کردۆتەوە، ئەم زنجیرەیە کە بڵاوبۆوە موسڵمانان بەگەرمی پێشوازیان لێکردو گەلێ زاناو نوسەریش لە نوسراوەکانیاندا ئاماژەیان بۆ کردوە تا موسڵمانان بەهرەی لێوەرگرن، لەناو موسڵمانانی کوردیش سەیر دەکەین چەندین نۆرە چاپی لێ دەردەکرایەوە، کە ئەمەش بەڵگەیە بۆ چاکیو سودی ئەم زنجیرەیە، بەم پێودانگە پێمان وایە وەرگێڕانی ئەم زنجیرەیە گەلێك پێویست بو بۆ ڕابونی ئیسلامی لەکوردستان، تا گەلی کوردیش لەبیروباوەڕە سازگارەکەی خۆی حاڵی بێت و لاڕێ نەبێ، لەبەر گرنگیو لەبەر چاکیو بەهرەی ئەم زنجیرەیە، پشت بەخوا بڕیارمان دا وەریگێڕینە سەر زمانی کوردی، لەوەرگێڕانەکەدا هەوڵمان داوە ئاستێکی زمانەوانی باشی پێبدەین و ئیشکالات بۆ خوێنەر بەجێنەهێڵین، وا بەرهەمەکان لەبەردیدی خوێنەرانەو ئەوان دەتوانن وەرگێڕانەکە هەڵسەنگێنن ، لەخوا داواکارین لەکارەکەماندا سەرکەوتووبین و توانیبمان خزمەتێك بەم ڕابونە پیرۆزەی کوردستان بکەین، خوا پاداشتی بەرهەراوی خۆی بەئێمەو ئێوەش ببەخشێ.

ژیوانی گەلاڵی　　　　ئارامی گەلاڵی

# پێشـــەکی

**إن الحمـد لله، نحمـده، ونسـتعينه، ونسـتغفره، ونسـتهديه، ونعـوذ بـالله مـن شـرور أنفسـنا، وسـيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، واشهد أن لا اله إلا الله وحده لا شريك له، واشهد أن محمداً عبده ورسوله، وبعد:**

بڕوابوون بەفریشتان یەکێکە لەبنەڕەتەکانی باوەڕ، ئەگەر نەبو ئیمان تەواو نابێ. فریشتە یەکێکن لەجیهانەکانی غەیب و، خوای گەورەش بەوان ئیمانداران هەڵگوتوە، کەباوەڕیان بەم هەواڵەی خوای بەرزو پێغەمبەرەکەی ﷺ هێناوە. دەقەکانی قورئان و سوننەت گەلێك لەم بابەتە دواون. لایەنەکانیان ڕون کردۆتەوە، هەرکەسێکیش چاو بەو دەقانەدا بگێڕێ کەلەم بارەیەن، بڕوای بەفریشتان دیارو ئاشکرا دەبێ و، سنوری بیرۆکەی تەمومژاوی جێ دێڵێ. دیارە ئەوەش مایەی ڕەگاژۆ بون و ڕۆچونی ئیمانە، چونکە ئاشنا بون بەوردودرشتی لایەنەکان بەهێزترو جێگیرترە لە شارەزا بونێکی تێکڕایی. دەقەکانیش بۆیە بەوردیو بەدرێژی لەم بابەتە دواون و، هەمو ڕوەکانیان دەرخستوە، چونکە ژیری مرۆڤ لەخۆڕا ناتوانێ بگاتە ئەو شتانەی کەپێویستە دەربارەی فریشتان بیزانێ. هەستەکانی مرۆڤ لەوە ناتەواوترن کەفریشتە ببینێو، ئاخاوتنیان ببیسێ. بێ گومان ئەو ناتەوانیەش لەبەرژەوەندی مرۆڤ دایە. چونکە ئەگەر مرۆڤ هەمو شتێکی دەوروبەری ببیستبا و بینیبای، نەیدەتوانی بژی. هێندە بەسە کە مرۆڤێك بێنینە پێش چاو، گوێی لەهەمو ئەو دەنگانە بێت، کەڕادیۆیەك وەریان

دەگرێ، تا بزانین چ بەڵایەك توشی ئەو بەستەزمانە دێ، ڕەنگە وای لێ بکا سەرگەردان و شێتیش بێ. کەسیش وا گومان نەبا تۆژینەوەی ئەم بنچینەیە لەزیادەکیە. چونکە ئەو ڕاستیانەی لەمیانەی دەقەکانی ئەم بابەتە هاتون شون و کاریگەری گەورەیان هەیە لە ڕەتکردنەوەی پڕوپوچ و بیروبۆچونی چەوتو چەوێل لەئاوەزی هەندێ کەسدا، کەلەزوەوە دەربارەی ئەم بابەتەدروست بون. هەر لەپێشانەوە ئەو گۆتەیە بڵاوبۆتەوە کەفریشتەکان خواوەندن، یان فریشتەکان کچی خودان. هەندێك پیتۆڵیش وای بۆ چون ئەو ئەستێرانەی لەگەردون دا دەیانبینین، ئەوانە فریشتەن. جا ئەو ڕاستیانەی لەو دەقانەدا هاتون، باوەڕو ئیمانمان بەخواوەندی پەرستراوی زاڵ و دەسەڵاتداری سەرئەو بونە، قوڵ و دامەزراو دەکا، ئەو خوایەی کەلەشکری خۆی لەفریشتان ڕاسپاردون بۆ جێبەجێ کردنی کاروباری جیاجیای ئەم بونەوەرە. پەیوەندی فریشتانیش بەئێمە لەڕوی پێکهاتەو ئافەریدکردن و چاودێری کردنەوە گرنگێتی و بەهای مرۆڤ دەردەخاو، بیرۆکەی بێفەڕیو بێڕێزی لەهزریدا ڕەت دەکاتەوە، بەهەندێش مرۆڤ ڕێزو قەدری خۆی دەزانێ و، هەوڵ و کۆشش دەکا بۆ هێنانەدی ئەو ڕۆڵە مەزنەی کەپێویستە پێی هەستێ. ئەگەر بمانەوێ هەمو ئەو شوێنەوارە باشانە بژمێرین کەمرۆڤ لەباوەڕهێنان بەفریشتان و، لێکۆڵینەوەی ئەو دەقانەی دەربارەیان دەدوێ، دەستی دەکەون. پێشەکی یەکەمان زۆر درێژ دەبێتەوە. بەڵام من واز لەخوێنەر دێنم تا لەگەڵ دەقەکان بژی، جاکاتێك لێیان ورد دەبێتەوە، هەست بەکاریگەریان دەکا. لەخوای بەرز داواکارین ئەم کتێبە بکاتە مایەی سود بەخشین و، بەپاکی و چاکی بۆخۆی قەبوڵی بکا، هەر خوا چاکترین پشتیوان و چاکترین سەرخەرە.

**عومەر سلێمان ئەشقەر**

کوێت ۲۰/ذوالقعیدة/۱۳۷۸ك

۱۹۷۸/۹/۲۲ز

# سیفەت و تواناکانیان

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەیــن لەمیانــەی دەقەڕاسـتەکان دا، لەسـیفەتە سروشـتی و ڕەوشتیەکانی فریشتان بکۆڵینەوەو بیانخەینە ڕو، پاشانیش لەبارەی تواناکانیــان بدوێـین کەخوای گەورە پێیانی بەخشیوە.

# سیفەتە سروشتیەکان

**کەرەستەی ئەفراندن :**

**پێغەمبەر ﷺ لەفەرمودەیەکدا کە عائیشەی کچی ئەبو بەکر** (رضي الله عنها) **دەیگێڕێتـەوە ئـەوەی پێمـان ڕاگـەیاندوە ئـەو کەرەسـتەیەی فریشـتەکانی لێ ئافەریدەکراون ڕوناکی یە. کەفەرمویەتی:**(خلقت الملائكة من نور، وخلق الجـــان من مارج من نار، وخلق آدم مما وصف لكم: **فریشتەکان لەڕوناکی ئەفرێنراون و، جنۆکـە لەبلێسـە ئـاگرێك ئافـەریدە کــراون و، ئـادەمیش لــەوە ئــەفرێنراوە کەبۆتان وەسف کراوە**[1]**.** ) (رواه مسلم في صحيحه)

**جـا پێغەمبـەر ﷺ ئــەوەی بــاس نــەکردوە چ ڕوناکیەکــە فریشــتەی لێ ئەفرێنراوە، بۆیە ئێمـەش ناتوانین زیاتر لەم مەسەلەیەدا قوڵ بینـەوە و پتر سنورداری بکـەین. چونکە ئەمە غەیبێکەو، لـەم فەرمودەیە بترازێ چـی دی لەسەر نەهاتوە ڕونی بکاتەوە. هەرچی ئەوەشە کەلە (عیکریمە) دەیگێڕنەوەو دەڵـێ: (فریشـتە لـەروناهی عـیززەت ئـەفرێنراون و، ئیبلیسـیش لـەئاگری**

---

۱ کەسانێك هەن کە دەدرێنە پاڵ زانست ئەم فەرمودەیە و هاوشێوەکانی ڕەت دەکەنەوە و دەڵێـن فەرمودەیەکی یەکانی (آحاد) ە و، فـەرمودەی یـەکانیش بیروبـاوەڕی پـێ ناسـەلمێ، لەنامیلکەیـەك بەناوی (اصل الاعتقاد) ، وتووێژم لەو گۆتەیە کردوەو ڕونم کردۆتەوە کەبەتاڵە .

عـيززەت هاتۆتـــە ئـەفراندن) يـان ئـەوەی لـە عـەبدوڵلای كـوڕی عـەمرەوە دەيگێرنـەوە كـەدەڵێ: (خـوای گـەورە فريشـتەی لـەڕوناهی هـەردو باسـك و سينگ ئافەريدە كردوە) . ئەوانە وەرناگـيرێن، ئەگـەر بەڕاسـتيش لـەو زانـا پايەدارانـەوە هـاتبن، ئـەوانيش مرۆڤـن و لەهەڵـە بـەدەرنين، دەشـبێ كەلـە ئيسرائيلياتەوە هەڵيانهێنجابێ. (بگەڕێوە بۆسلسلة الاحاديث الصحيحة ١/١٩٧) .

هـەروەها وەلييوڵلای دەهلی لـەكتێبی (الحجة البالغة) لەلاپـەرە (٣٣)دا دەڵێ: (فريشتەكان سێ بەشن: بەشێكيان ئەوانەن كەخوای گەورە زانيويەتی سيسـتەمی خێروچاكـە لەسـەر ئـەوان ڕادەوەسـتێ. جـا جەسـتەی نوريـنی ئەفراندوە بەپلەوپايەی ئاگرەكەی موسا ئەوجا بەنەفسی پاك و پڕشكۆ فوی پێداكردون.

بەشێكيان لەتێكەڵەی هەڵمەناسكەكانی ڕەگـەزەكان پێك هـاتون كـەوای كردوە نەفسی بەرزو بالأيان تێدا هەڵقوڵێو زۆر بـەتوندی پيسيـە ئاژەڵيـەكان ڕەت دەكاتەوە.

بەشـەكەی تـر ئـەو نەفسـە ئينسـانيانەن، لەفريشـتانەوە نزيكـن و هـەر خـەريكی ئـەنجام دانـی كـردەوەی ڕزگاركـەرن كەسـودی هەيـە بـۆ گەيشـتنە فريشتان. تاوای لێ دێ پۆشاكی جەستە دادەماڵن و دەچنە ڕيزی فريشتان و لەوان دەژمێردرێن).

لێرەشدا دەبينين هيچ بەڵگەيەكی صەحيح لەسەر ڕاستێتی ئەم دابـەش كردنە، بەم شێوازەو شێوەيە نيە.

## كەی ئافەريدەكراون ؟

ئێمە نازانين فريشتەكان كەينێ ئەفرێنراون، چونكە خودای پـاك و تـاك ئەم هەواڵەی پێ نەداوين. بەڵام دەزانين كەئەفراندنی وان وەپێش ئـەفراندنی ئـادەمی بـاوكی مـرۆڤ كـەوتوە. چونكـە خـوای بـەرز پێـی ڕاگـەياندوين،

کەفریشتەکانی ئاگادارکردۆتەوە لەوەی جێنشینێك لەزەوی دادەنێ ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً: وەکاتێك پەروەردگاری تۆ بەفریشتانی فەرمو: من لەزەویدا جێنشینێك دادەنێم ﴾ سورة البقرة/٣٠.
مەبەستیش لەجێنشین ئادەمەعليه السلام. جا کە ئادەمی ئافەریدە کرد، فەرمانی پێکردن سوژدەی بۆ ببەن ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ : جاکاتێك کارەکەیم تەواوکرد و رۆحم تێدا گرواند، ئێوە هەمو سوژدەی بۆ ببەن ﴾ سورة الحجر/٢٩..

## مەزنێتی ئەفراندنیان :

خوای گەورە لەبارەی فریشتەکانی دۆزەخ دەدوێ: ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلاَئِكَةٌ غِلاَظٌ شِدَادٌ لاَ يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ: ئەی کەسانێك کەبڕواتان هێناوە!خۆو خاو خێزانتان لەئاگرێك بپارێزن دەستە چیلەکەی مرۆڤەکان و بەردەکانن، کەبەفریشتە گەلێك ئەسپێردراوە زۆر تورەو بەهێزن، هەرچی خودا پێیان بسپێرێ نافەرمانی ناکەن و، هەر ئەوە دەکەن کەڕاسپێردەیانە﴾ سورة التحريم ٦
لێرەدا تەنها ئەو فەرمودانە دەهێنینەوە کەدەربارەی دو فریشتەی شکۆدار و خاوەن پلەو پایە دەدوێن.

## مەزنێتی جیبریل :

ئیمامی ئەحمەد لەموسنەدەکەیدا، لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود دەگێرێتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ جیبریلی لەسەر وێنەی خۆی بینی،

شەشسەد باڵی هەبو، هەرباڵێکی بەری ئاسۆی گرتبو. دوڕو یاقوتی ڕەنگاوڕەنگ و جۆراوجۆر لەباڵەکانی دادەبارین. (ئیبنیکەثیر) لەبارەی ئەم فەرمودەیەدا دەڵێ: ئیسنادەکەی باشە (البداية ١/٤٧) وەلەسونەنی تیرمیذی بەسەنەدێکی صەحیح هاتوە کەپێغەمبەر ﷺدەربارەی جیبریل فەرمویەتی: "رأيته منهبطاً من السماء ساداً عظم خلقه ما بين السماء والارض: جیبریلم دیت لەئاسمانێ دادەبەزی، هێند مەزن بو، نێوان ئاسمان و زەوی داگرتبو".

خوای گەورەش لەوەسفیدا دەفەرمویٚ:﴿ إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ، ذِي قُوَّةٍ عِنْدَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ، مُطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ: بەڕاستی ئەو قورئانە قسەی ڕەوانەکراوێکی خاوەن ڕێزە، خاوەن هێزە، لەلای خوای عەرش، خاوەنی پلەو شوێنپایەیە، فەرمانڕەواو دەسپاك و سەر ڕاستە ﴾سورة التكوير ١٩-٢١.

## مەزنێتی هەڵگرانی عەرشی خوا:

ئەبو داود لەجابیری کوڕی عەبدوڵلای ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی: "أذن لي ان احدث عن احد حملة العرش ما بين شحمة اذنه وعاتقه مسيرة سبعمائة عام : مۆڵەت دراوم باسی یەکێك لەهەڵگرانی عەرش بکەم، کەنێوان چیچلەی گوێی تاسەرشانی هەفتسەد ساڵە رێیە". ئیبنی ئەبی حاتەم دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (تخفق الطير: ئەگەر باڵدار تێیدا بفڕێ). توێژەرەوەی (مشكاة المصابيح) دەڵێ: سەنەدەکەی صەحیحە (٣/١٢١)، سەیری تەخریجەکەی شێخ ناصر بکە لە (الاحاديث الصحيحة ١/٧٢).

طەبەرانی لە (المعجم الاوسط) بەسەنەدێکی صەحیح لەئەنەسەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "اذن لي ان احدث عن احد حملة العرش، رجلاه في الارض السفلى، وعلى قرنه العرش، وبين شحمة اذنيه وعاتقه خفقان السطير سبعمائة عام، يقول (أي الملك): سبحانك حيث كنت: مۆڵەتم درا، لەبارەی

یەكێك لە هەڵگرانی عەرشی خوا قسە بكەم، پێیەكانی لەزەوی خوارەوەن و، عەرش لەسەر شاخیەتی، وەنێوان چیچیلەی گوێی‌و شانی بەباڵی باڵدار هەفتسەد ساڵ ڕێیە، فریشتەكە دەڵێ: پاكی و پەسەنی بۆ تۆ خوای بەرز لەهەر كوێ هەی".

## فریشتەكان باڵیان هەیە :

فریشتەكان باڵیان هەیە وەك خوای بەرز هەواڵی پێداوین. هەیانە دوباڵی هەیەو، هەیە سێ باڵی هەیە، یان چوار و، فریشتەش هەیە زیاتری هەن:﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ جَاعِلِ الْمَلائِكَةِ رُسُلاً أُولِي أَجْنِحَةٍ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ : هەمو ستایش بۆ خوا كە ئەفرێنەری ئاسمانەكان و زەوی یە، ئەو خوایەی فریشتەكانی كردە پەیام بەرانێك كەخاوەنی باڵ گەلێكن، دو دو و سێ سێ و چوار چوار، ئەو خوایەی هەرچی بیەوێ لەبەدیهێنان و ئافەریدكردن زیادی دەكا، بەڕاستی خوا بەسەر هەمو شتێكدا توانادار و بەدەسەڵاتە ﴾سورة فاطر/١.

## جوانی فریشتان :

خوای گەورە فریشتەكانی لەسەر شێوەو وێنەی زۆر جوان و چەلەنگ ئەفراندون، هەروەكو دەربارەی جیبریل دەفەرموێ ﴿ عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى، ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى ﴾ سورة النجم ٥/٦. ئیبنی عەبباس دەفەرموێ: (ذو مرة) واتە؛ خاوەن دیمەنی جوان و قەتادە دەڵێ: بەمانای خاوەن بالایەكی بەرزی جوان دێ. دەشڵێن: (ذو مرة)، واتە: خاوەن هێز. هەردو گۆتەش تەواو تێك دەكەنەوە، جیبریل بەهێزەو دیمەنیشی جوانە.

لەلای خەڵکیش وا باوە کە فریشتان بەجوانی وەسف بکەن. هەروەکو واش باوە شەیتانەکان بەناشیرینی وەسف بکەن. لەبەر هەندێشە کەدەبینی مرۆڤی جوان بەفریشتە دەشوبهێنن، تەماشاکە ژنەکان کەچاویان بەحەزرەتی یوسف کەوت چی‌یان پێ گوت: ﴿ ..فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَذَا بَشَرًا إِنْ هَذَا إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ : جا کاتێك چاویان بە (یوسف) کەوت، سەریان لەجوانی سورماو بەگەورە و بێوێنەیان داناو هەمو دەستی خۆیان بڕی و، گوتیان: بێخەوشی بۆ خوایە، ئەمە بەشەر نیە، ئەمە هەر فریشتەیەکی هێژاو خاوەن ڕێزە ﴾ سورة یوسف/٣١.

## ئایا لەشێوەو وێنەدا وێکچون لەنێوان فریشتەو مرۆڤدا هەیە ؟:

موسلیم لەصەحیحەکەیداو تیرمیذی لەسونەنەکەی لەجابرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: "عرض علي الانبياء، فاذا موسى ضرب من الرجال، كانه من رجال شنوءة، ورأيت عيسى ابن مريم، فاذا اقرب من رأيت به شبهاً عروة بن مسعود، ورأيت ابراهيم فاذا اقرب من رأيت به شبهاً صاحبكم، (يعني نفسه) .ورأيت جبريل، فاذا اقرب من رأيت به شبهاً دحية: پێغەمبەرانم پێ‌نیشان دران. جا موسا جۆرێك بو لەپیاوان، وەك لەپیاوانی خێلی (شنوءة) بێ وابو. عیسای کوڕی مەریەمیشم دیت، نزیکترین کەسێك من دیبم بەوی بچێ عوروەی کوڕی مەسعودە، ئیبراهیمیشم بینی و، نزیکترین کەسێکم دیتبێ بشوبهێتەوی هاوەڵی ئێوەیە (پێغەمبەر خۆی ﷺ) . هەروەها جیبریلم دیت و نزیکترین کەسیشم دیبێ بەوی بچێ دەحیەیە".

جا ئایا ئەو وێك چونە لەنێوان وێنەی ڕاستەقینەی جیبریل و وێنەی دەحیەی کەلبیە، یا لەنێوان وێنەی جیبریلە کە خۆی دێنێتە سەر وێنەی ئادەمی یان؟! دیارە ئەمەی دوایی‌یان پەسەندترە، چونکە جیبریل گەلەك جاران خۆی لەوێنەی دەحیەدا ڕادەنواند.

## فریشتەكان لە سروشت و شێوەو لە پلەو پایەشدا جیاوازن:

فریشتەكان هەمو یەك شێوەو یەك پایەیان نیە، هەندێك فریشتە هەن دو باڵیان هەیە و هەندێك سێ باڵ و، جیبریل شەش سەد باڵی هەیە، لەلای خوای پەروەردگاریش هەریەكەو پلەو پایەیەكی جیاوازو دیاری كراوی هەیە، ﴿ وَمَا مِنَّا إِلاَّ لَهُ مَقَامٌ مَعْلُومٌ : هەریەك لە ئێمە شوێنپایەو پلەیەكی دیاری هەیە ﴾ سورة الصافات/١٦٤.

هەروەها خوای كاربەجێ لەبابەت جیبریل دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ، ذِي قُوَّةٍ عِنْدَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ : جیبریل شوێن و پلەوپایەیەكی بەرزوبالای لەلای خودای بەرز هەیە ﴾ سورة التكوير ١٩-٢٠.

چاكترینی فریشتانیش ئەوانەن كە بەژداری غەزای بەدریان كردوە، هەروەك لەصەحیحی بوخاریدا لەرەفاعەی كوڕی رافیع هاتوە: جارێك جیبریل هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وپێی فەرمو: "ما تعدون من شهد بدراً فيكم ؟ ئەوانەی لەغەزای بەدردا بەژدارییان كرد، لەنێوخۆ چۆنیان حسێب دەكەن". پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "خيارنا چاكترینمانن"، جیبریل فەرموی: "وكذلك من شهد بدراً من الملائكة هم عندنا خيار الملائكة هەروەها ئەو فریشتانەی لەغەزای بەدردا بەژداربون لەلای ئێمەدا لەچاكترینی فریشتانن".

## فریشتە بەنێرینەو مێینە وەسف ناكرێن:

یەكێك لەهۆكارەكانی گومڕابونی ئادەمیان لەكاتی ئاخاوتن دەربارەی جیهانەكانی غەیب ئەوەیە، هەندێكیان هەوڵ دەدەن ئەو جیهانانە بخەنەبەر پێوەری مرۆڤانەی دونیایی، دەبینن هی وا هەیە سەیری بەوەی دێ، كە پرسیارێك ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ دەكراو پێویستی دەكرد لەخواوە وەڵامی بۆبێ، جیبریل پاش چەند چركەیەك دەهاتە لای پێغەمبەر. دەڵێ چۆن بەو

خێراییە لەڕادەبەدەرە دەهات، لەکاتێکدا تیشك پێویستیی بەملیۆنان ساڵی ڕۆناکی دەبێ تا دەگاتە هەندێك ئەستێرەی ئاسمانی.

ئەو بەستەزمانە نازانێ خۆی دەکاتە هاونمونەی پێشکەیەك کەخێرایی فڕۆکە بەپێوەری تایبەتی خۆی بپێوێ. ئەگەر لەمەسەلەکە ورد بێتەوەو تێبفکرێ، دەزانێ کەجیهانی فریشتان، پێوەرەکانی تەواو جودان لەپێوەرەکانی ئێمەی مرۆڤ.

هاوبەش دانەرە عارەبەکانیش لەو بوارەدا گومڕابون و، فریشتەکانیان بەمێینە دادەنا، جا ئەو گۆتنە دور لەڕاستی یەشیان بەئەفسانەو پڕوپوچی یەکی مەزنتر و گەورەتر تێکەڵ کردبو و، دەیانگوت ئەو مێینانە کچانی خوان.

قورئانی پیرۆزیش لەهەردو دۆزەکەدا وتووێژی لەگەڵ کردن و، ئەوەی بۆیان ڕون کردەوە کە لەبۆچونەکەیان دا پشتیان بەبەڵگەی ڕاست نەبەستاوەو، گۆتنەکەشیان داڕوخاو بێبناغەیە. سەیریش لەوەی دایە کە کچان دەدەنە پاڵ خواو. بەخۆشیان ڕقیان لەکیژان دەبێتەوە، کاتێکیش هەریەکێکیان موژدەی ئەوەی دەدرێتێ کەخوا کچی داوەتێ، ڕەنگی ڕوی ڕەش دادەگەڕێ و ڕق و کینەکەی دەخواتەوەو، ڕەنگە لەشەرمی ئەو موژدە خراپە خۆی لەخەڵکی بشارتەوە، وادەبێ دەگاتە ڕادەیەك ئەو هەش بەسەرە دۆخ و سنوری خۆی ببەزێنێ ، وئەو کیژۆڵە ساوایە لەخۆڵێدا وەشێرێو، زیندەبەچاڵی بکا. لەگەل ئەو هەمو شتانەشدا دەڵێن خوا منداڵی هەیەو، منداڵەکانیشی مێینەن و، بەم جۆرە ئەفسانە دروست دەبێ و پەلوپۆ داوێ، لەئاوەزی ئەوان کەسانی کەپەیوەندی بەنور و ڕوناکی خواوە ناکەن. گوێ بدە ئەو ئایەتانە کەسەربردەی ئەو ئەفسانەو پڕوپوچانە باس دەکاو وتوویژ لەگەل خاوەنەکانیاندا دەکا: ﴿ فَاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ وَلَهُمُ الْبَنُونَ، أَمْ

خَلَقْنَا الْمَلائِكَةَ إِنَاثًا وَهُمْ شَاهِدُونَ، أَلا إِنَّهُمْ مِنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ، وَلَدَ اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ، أَاصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ، مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ، أَفَلا تَذَكَّرُونَ، أَمْ لَكُمْ سُلْطَانٌ مُبِينٌ:
**جا لەوانە بپرسە: ئایا کچ هی پەروەردگارتەو کوڕیش هی ئەوانە، یان ئێمە فریشتانمان مێینە ئەفراندون و ئەوان شایەد بون، ئاگاداربن، بەڕاستی ئەوانە لەدرۆزنی خۆیانە دەڵێن خوا منداڵی بوەو، بەڕاستی ئەوانە درۆزنن، ئایا خودا کچانی بەچاتر لەکوڕان هەڵبژاردوە، چیتانە چلۆن داوەری دەکەن، جا ئایا بیرناکەنەوە، یان بەڵگەو بیانوی رونتان لەم بارەوە هەیە** ﴾ سورة الصافات/١٤٩-١٥٦.

**خوای گەورە ئەو قسەیەی ئەوانی کردۆتە شایەدیەك و لێیان دەپێچێتەوە، چونکە قسەکردن دەربارەی خوای گەورە بەبێ زانست لەمەزنترین گوناهانە:** ﴿ وَجَعَلُوا الْمَلائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَانِ إِنَاثًا أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ : **وەفریشتەکان کەبەندەی خوان بەمێینەیان دانان. ئایا لەکاتی ئافەریدکردنی ئەوان لەوێ حازربون، بەزویی ئەم گەواهی دانەیان دەنوسرێ و لێیان دەپرسرێ** ﴾ سورة الزخرف/١٩.

### نەدەخۆن و نەدەخۆنەوە:

**لەپێشدا ئاماژەمان بەوەکرد فریشتە بەنێرینەو مێینە وەسف ناکرێن، دەبێ ئەوەش بزانین نەپێویستیان بەخۆراکی مرۆڤە نەبەخواردنەوەیان، هەروەکو خوای گەورە هەواڵی پێ داوین کەفریشتە بەوێنەی ئادەمی هاتنەلای ئیبراهیم ﷺ ئەمیش خواردنی پێشکەش کردن بەلام ئەوان دەستیان بۆ درێژ نەکرد. بۆیە ئیبراهیم ﷺ لەئاستیان دا ترسی لێ نیشت. ئەوجا ئەوان حەقیقەتی خۆیانیان بۆ ئاشکرا کرد. بەوەترس و**

پەشۆکانەکەی نەما: ﴿ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ، إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ قَوْمٌ مُنكَرُونَ، فَرَاغَ إِلَى أَهْلِهِ فَجَاءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ، فَقَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ، فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لَا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ: ئایە هەواڵی میوانە بەڕێزەکانی ئیبراهیمت پێ گەیشتوە؟، ئەو دەمەی چونە لای و گوتیان: سلاو، ئەویش گوتی: سلاو، بۆمن کەسانی نەناسراون، جا بەنهێنی چوە لای خاوخێزانیو گۆلکەکی قەڵەوی بەبرژاوی و کولاوی بۆ ئەوان هانی، جا لەنێزیکەوانی دانا بەلام لێیان نەخوارد بۆیە گوتی: ئایا ناخۆن، جا لەدڵدا ترسا، گوتیان: مەترسێ ئێمە ڕەوانەکراوی خوداین و بەکوڕێکی زانا مزگێنیان پێدا ﴾ سورة الذاريات/٢٤-٢٨.

لەئایەتێکی دیکەشدا دەفەرمێ: ﴿ فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لَا تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ: جا کەدیتی دەستیان پێی ناگاو لێی ناخۆن ئەوانی ناحەز هاتە بەرچاوان و لێیان ترسا، بەلام پێیان گوت: مەترسە، ئێمە بۆلای هۆزی لوط ڕەوانە کراوین ﴾ سورة هود/٧٠.

## نەبێزار دەبن نەماندو دەبن:

فریشتەکان بەپەرستن و گوێڕایەڵی و پیادەکردنی فەرمانەکانی خوای گەورەوە خەریکن. بێ ئەوەی وەڕس و بێزار بن. ئەو بێ تاقەت بون و بێزاری یەی توشی مرۆڤی دێ لەوان دورە، خوای بەرز لەوەسفی فریشتەکانیدا دەفەرمێ: ﴿ يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ: شەوو ڕۆژ پاکیگاری خوا دەکەن و سست و ماندیش نابن ﴾ سورة الانبياء/٢٠.

لەئایەتێکی تریشدا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ اسْتَكْبَرُوا فَالَّذِينَ عِنْدَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُمْ لاَ يَسْأَمُونَ: جا ئەو فریشتانەی کەلای پەروەردگارتن بێ ئەوەی وەڕەز و ماندوبن شەووڕۆژ پاکی وبێخەوشی ئەو دەڵێن ﴾ سورة فصلت/٣٨.

## نشینگەی فریشتان:

نشینگەو ماڵی فریشتان ئاسمانە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْ فَوْقِهِنَّ وَالْمَلاَئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ: نیزیکە ئاسمانەکان لەبەرامبەر گەورەیی خودا لەبانەوە پرش و بڵاوبنەوەو، فریشتەکان هەمیشە پاکی و ستایشی پەروەردگاری خۆیان بەجێ دەهێنن ﴾ سورة الشورى/٥.

خوای بەرزیش بەوە وەسفی کردون کە فریشتەکان لەلای خۆی دان، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ اسْتَكْبَرُوا فَالَّذِينَ عِنْدَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُمْ لاَ يَسْأَمُونَ: جا ئەگەر ئەوانە خۆیان بەگەورەتر زانی لەوەی عیبادەتی خوا بکەن. ئەوا ئەو فریشتانەی لای پەروەردگارتن بێ ئەوەی وەڕەزو شەکەت بن شەووڕۆژ پاکی و بێخەوشی وی دەڵێن ﴾ سورة فصلت/٣٨.

هەروەها بەپێی فەرمانی خوای کاربەجێ دادەبەزنە سەر زەوی، تا ئەوان ئەرکان جێبەجێ و پیادەبکەن کەلەسەر شانیان دانراوە و پێیان راسپێرداوە. ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلاَّ بِأَمْرِ رَبِّكَ: بەفەرمانی پەروەردگارت نەبێ، ئێمە نایەینە خوارێ ﴾ سورة مريم/٦٤. جا لەهەندێك بۆنەی تایبەتدا دابەزینیان

زیاتردەبێ، وەکو شەوی قەدر، ﴿ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ، لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ، تَنَزَّلُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ: شەوی قەدر باشترە لەهەزار مانگان، لەو شەوەدا فریشتەکان و روح بەفەرمان و مۆڵەتی خودا دادەبەزن، بۆ ئەنجام دانی کاروفەرمانەکانیان ﴾ سورة القدر/٣-٤.

## ژمارەیان:

فریشتەکان گەلێك زۆرن و تەنها ئەو خوایەی ئافەریدەی کردون ژمارەیان دەزانێ ﴿ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلاَّ هُوَ: بێجگە لەخوا کەس بەژمارەی لەشکریانی پەروەردگارت نازانێ ﴾ سورة المدثر/٣١. ئەگەر دەتەوێ بەزۆری ژمارەشیان ئاشنابی، گوێ بدە ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ لەبارەی بەیتولمەعمورەوە فەرمویەتی، کەدەکەوێتە هەفتەمین ئاسمان: "فاذا هو يدخله في كل يوم سبعون الف ملك، لايعودون اليه آخر ماعليهم: جا هەمو ڕۆژێك هەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناو بەیتولمەعمور، جارێکی تر بۆی ناگەڕێنەوەو ئەمەش دوایین باری ئەوان فریشتانە " (رواه البخاري ومسلم).

لەصەحیحی موسلیمیشدا لەعەبدوڵلاوە هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "يؤتى بجهنم يومئذ لها سبعون الف زمام مع كل زمام سبعون الف ملك: لەڕۆژی پەسلاندا دۆزەخ دەهێنرێ هەفتا هەزار جڵەوی هەیەو، هەر جڵەوێکیش هەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵدایە".

بەپێی ئەم فەرمودە پیرۆزە، هەر ئەو فریشتانەی کەلەڕۆژی دواییدا دۆزەخ دەهێنن چوار هەزارو نۆسەد ملیۆن فریشتەن.

ئەگەر تەواو لەو دەقانە ڕامێنین کە لەبارەی ئەو فریشتانەوە هاتون کەکاروباری مرۆڤیان پێ ڕاسپێردراوە، ڕادەی زۆری ژمارەیان دەزانین،

فریشتەیەك تۆمەكەی پێ سپێرراوەو، دو فریشتە تایبەتن بەتۆماركردن و نوسینەوەی كاروكردەوەی هەر مرۆڤێك، فریشتەیەك تایبەتە بەپاراستنی و، فریشتەیەكیش یاوەرێتی بۆ رێنمونی و رابەرێتیكردنی. هەروەك باسی لێوە دەكەین.

## ناوەكانیان

فریشتەكان ناویان هەن، بەلأم ئێمە هەر ناوی ژمارەیەكی كەم لەفریشتەكان دەزانین. لێرەدا ئەو ئایەتە پیرۆزانە دەخەینە بەر دیدە كەناوی فریشتانیان تێدا هاتوە.

### ١، ٢ ـ جیبریل ومیكائیل :

خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ، مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ: بلێ؛ كەسێك كە دوژمنی جوبریل بێ دەبێ بزانێ كەدوژمنی خوایە. چونكە ئەو بەفەرمانی خوا قورئانی نازڵ كردە ناو دڵو دەرونی تۆ، قورئانێك كە كتێبە پێشینەكانی بەردەستی ئێوەی بەڕاست داناوەو مایەی رێنمونی و مزگێنیە بۆ بڕواداران، كەسێك دوژمنی خواو فریشتەكان و پێغەمبەرانی ئەوو دوژمنی جبرائیل و میكائیل بێ كافرە، جا بەڕاستی خوا دوژمنی كافرانە ﴾ سورة البقرة/٩٧-٩٨.

هەروەها جیبریل ئەو (روح الامین)ەیە كەلەو ئایەتە پیرۆزەدا باسی كراوە بە ﴿ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ، عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنْ الْمُنذِرِينَ: روحولئەمین ـ

جیبریل ـ نازڵی کردوە، بۆسەر دڵ ودەرونی پاکی تۆ تا لە ترسێنەران بی ﴾ سورة الشعراء/١٩٣-١٩٤.

هـــەروەهـــا ئـــەو (روح)ەی بـــۆ مـــەریـــەم رەوانـەکـــرا ئەویـــش جیـبریـلـــە: ﴿ فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا :لەودەمەدا رۆحی خۆمان نارده لا ﴾ ســـورة مريم/١٧.

## ٣- ئیسرافیل

هـەروەها ئیسـرافیل ئـەو فریشـتـەیەیە کـەفو بـە کـەڕەنادا دەکات، ئەگـەر شـەوان پێغەمبـەر ﷺ وەئاگابـهاتبا نـاوی جیـبریل و میکـائیل و ئیسـرافیلی لەنزاو پاڕانەوە دەهێنا و دەیفەرمو: "اللهم رب جبريل وميكائيل واسرافيل انـــت تحكم بين عبادك فيما كانوا فيه يختلفون. اهدني لما اختلفت فيه من الحق بـــاذنك انـــك تهدي من تشاء الى صراط مستقيم: خودایـە، پـەروەردگاری جیـبریل و میکـائیل و ئیسرافیل، تۆ داوەری دەکەی لەنێوان بەندەکانت لەوان شتانی تێیدا جیا ڕاو جیـاوازن لـەنێو ئـەو جیاڕاییـەدا بـەئیزنی خـۆت بـۆ حـەق ڕێنمـایم بکـە، تـۆ هەرکەسێکی بتەوێ بەرەو ڕاستەڕێ ڕێنمونی دەکەی".

## ٤- مـالیك :

هەروەها فریشتەیەکیش مالیکە، کە دەرگـەوانی دۆزەخـە ﴿ وَنَادَوْا يَامَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ: وەهـاوار دەکـەن، هـۆ مـالیك بەپـەروەردگارت بڵێ تا بمانکوژێ بەڵکو ئاسودە بین، دەڵێ: بەڕاستی ئێوە قەتیسن ﴾ ســـورة الزخروف/٧٧.

### ٥- ريضوان :

ئيبنى كەثير دەڵێ (گەنجينەوان و دەرگەوانی بەهەشتێ فريشتەيەكە پێی دەڵێن ريضوان، ئەم ناوەش بەئاشكرايی لەهەندێ فەرمودانـدا هاتوە) (البداية: ١/٥٣).

### ٦، ٧-مونكەر و نەكير:

لەو فريشتانەن كەپێغەمبەر ﷺ ناوی هێناون: مونكەر و نەكيرن كەزۆر جاران لەباسی پرسياری نێوگۆڕ لەفەرمودانـدا باسيان كراوە

### ٨، ٩-هاروت و ماروت:

هەروا دو فريشتەی ديكە هەن خوای گەورە بە (هاروت و ماروت) ناوی ناون، وەك دەفەرموێ: ﴿ . . وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلاَ تَكْفُرْ . . : سلێمان جادوی نەكردو كافر نەبو، بەڵام شەيتانەكان كافر بون و خەڵكيان فێری سيحر دەكرد، وەلەوەی بۆ دو فريشتەكەی بابيل هاروت و ماروت دابەزی، هيچ كەسيان فێرنەدەكرد مەگەر لەبەرێ پێيان دەگوت: ئێمە هۆی ئەزمون و تاقيكردنەوەين، وشيار بە، كافر نەبی..﴾ سورة البقرة/١٠٢.

لەميانەی ئايەتەكەدا ئەوە دەردەكەوێ، كەخوای گەورە ڕۆژێك لەڕۆژان ئەم دو فريشتەيەی بۆ تاقيكردنەوەی خەڵك هەناردوە. لەكتێبەكانی تەفسيريشدا گەلێك ئەفسانەيان لەبارە هەڵبەستراوە كەهيچ كامێكيان لەقورئان و سوننەتدا نەسەلمێنراون، بۆيە دەربارەی ئەمانە پێويستە بەوهێندە زانياريە واز بێنين كەلەم ئايەتە پيرۆزەدا هاتوە.

### عیزرائیل:

لەهەندێ گۆتەدا ناوی فریشتەی گیان کێشان بەعیزرائیل هاتوە. بەڵام نەلە قورئانی پیرۆز و نەلە فەرمودە صەحیحەکاندا بەم ناوە ناونەبراوە. (البداية ١/ ٥٠).

### رەقیب و عەتید:

هەندێك لەزانایان دەڵێن فریشتە هەیە ناوی رەقیب و عەتیدە بەبەڵگەی ئەو ئایەتەی کەدەفەرموێ: ﴿ إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنْ الْيَمِينِ وَعَنْ الشِّمَالِ قَعِيدٌ، مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلاَّ لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ: کاتێ کەدو فریشتە لەلای ڕاست و لای چەپی مرۆ دانیشتون و کردەوەی دەنوسن، هیچ قسەیەکیش ناکا مەگەر فریشتەیەك چاوەدێری قسەکەیەتی ﴾ سورة ق/١٧-١٨.

بەڵام لێرەدا ڕاستیان نەپێکاوە، چونکە رەقیب و عەتید وەسفە بۆ ئەو دو فریشتەیەی کە کردەوەی بەندان تۆماردەکەن، (رەقیب و عتید)یش واتا دو فریشتەی ئامادەو بیناو شایەد کەهەرگیز لەبەندە دانابڕێن، نەك ناوبن بۆ دو فریشتان.

### ئایا فریشتەکان دەمرن ؟

فریشتەکان دەمرن وەك چۆن مرۆڤ و جنۆکەش دەمرن، زۆر بەڕونی خوای بەرز لەو ئایەتەدا باسی کردوە کەدەفەرموێ: ﴿ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ: فو بەشەیپوردا دەکرێ، جاهەمو ئەوانەی لەئاسمانەکان و زەوی دان دەمرن، مەگەر کەسانێکی خوا بیەوێ، لەپاشان جارێکیدی فو دەکرێتەوە

بەشەیپوردا، جا لەناکاو هەمو ڕاست دەبنەوەو چاوەڕوانی پاداش و سزا دەبن ﴾ سورة الزمر/٦٨.

جا ئەم ئایەتە فریشتانیش دەگرێتەوە، لەبەرئەوەی لەئاسمانن. ئیبنیکەثیر لەڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (ئەمەیان فوی دوەمە، کەفوی لەناوچونە، بەمەیان هەمو زیندوەکانی ئاسمانەکان و زەوی دەمرن، تەنیا کەسانێك نەبێ کەخوای گەورە نەیەوێ بمرن، هەروەکو بەرونی لەفەرمودە بەناوبانگەکەی باسی کەڕەنادا هاتوە، پاشان گیانی ئەوانەش دەکێشرێ کەماون، دوا کەسیش کەبمرێ فریشتەی مردنە، جا خوای زیندوی مشورگێڕ بەتاك و تەنیا دەمێنتەوە هەروەك چۆن یەکەمین بوە. بەمانەوەو بەردەوامی دوامینیش دەمێنتەوە. جا سێ جار دەفەرموێ: "لمن الملك اليوم: ئەمڕۆ مولك بۆکێیە؟" پاشان خوای گەورە هەر بەخۆی باگۆی خۆی دەداتەوەو دەفەرموێ: "لله الواحد القهار: بۆ خوای تاکی زاڵ"[٢].

هەروەها بەڵگە لەسەر ئەوەی فریشتە دەمرن، ئەو ئایەتەیە کەدەفەرمێ: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَهُ: هەمو شتێك تیا دەچێ، مەگەر روی پاکی ئەو نەبێ﴾ سورة القصص/٨٨.

بەڵام ئایا کەسیان لێ دەمرێ پێش ئەوەی فو بەکەڕەنادا بکرێت ؟ ئەمە شتێکە ئێمەنایزانین و ناتوانین تێیدا قوڵ بینەوە. چونکە بەئا یار بەنە هیچ دەقێکمان بەدەستەوە نیە.

# سیفەتە ڕەوشتیەکان

## . فریشتەکان پایەدارو چاکەکارن :

خوای گەورە لەوەسفی فریشتان دەفەرمویٚ: ﴿بِأَيْدِي سَفَرَةٍ، كِرَامٍ بَرَرَةٍ: قورئانی پیرۆز بەدەست ئەو فریشتانەوەیە کەسەفیرو باڵیۆزی خوای گەورەن بۆ پیٚغەمبەرەکانی﴾ سورة عبس/١٥-١٦. بوخاری دەڵێ: (سفرة: فریشتەکان، سَفَرْتُ واتا، نێوانم ڕێکخستن)، جا ئەو فریشتانەی کەسروشی خوای بەرز دادەبەزێنن و فەرمانبەرداری دەکەن. وەکو ئەو بالیۆزەن کەنێوانی قەومێك ڕێك دەخەن هەروەها خوای کاربەجیٚ ئەوان فریشتان بە ﴿كرام بررة﴾ وەسف دەکات، واتە شیٚوەو سروشتیان پڕ شکۆو جوان و هێژایەو، ڕەوشتیان و کرداریان چاك و پاك و بێگەردو تەواوە، هەر بۆیەشە دەبیٚ هەڵگرانی قورئان لەکردارو گوفتاریان سەر ڕاست و مەردانە بن.

ئیمام ئەحمەد لەعائیشە(رضي الله عنها) دەگێرتەوە کەدەڵیٚ: پیٚغەمبەرﷺ فەرموی: "الذي يقرأ القرآن وهو ماهر به مع السفرة الكرام البررة. والذي يقرأه وهو عليه شاق له اجران: ئەو کەسەی قورئان دەخوێنتەوەو تیٚیدا شارەزایە، لەگەل فریشتە بالیۆزە ڕیٚزدارو چاکەکارەکانە. ئەوەی دەشیخوێنێتەوەو لەبەری زەحمەتە، ئەو کەسە دو پاداشی هەیە " (وقد اخرجه الجماعة).

## شەرمداری فریشتان :

لەڕەوشتە دیارەکانی فریشتان، کەپیٚغەمبەر ﷺ هەواڵی پیٚ داوین ئابڕومەندی و بەشەرمیە، هەروەك لەو فەرمودەیەی کەموسلیم لە صەحیحەکەیدا، لەعائیشەوە(رضي الله عنها)، دەیگێڕێتەوە کە پیٚغەمبەر ﷺ

لەماڵی عائیشە ڕاکشابو و ڕانەکانی یا قاچەکانی بەدەرەوە بون، لەو کاتەدا ئەبوبەکر مۆڵەتی خواست، پێغەمبەرﷺ ڕێی پێ داو، خۆی تێك نەداو لەگەڵی کەوتە قسان. پاشان عومەر مۆڵەتی خواست و پێغەمبەر ﷺ ئیزنی دا بێتە ژورێو، هەر لەسەر حاڵی خۆی لەگەڵی دوا. پاشان عوسمان مۆڵەتی خواست، پێغەمبەر ﷺ هەستاوە دانیشت و جل وبەرگەکەی ڕێکخست، ئەوجا عوسمان هاتەژورێو، قسەی لەگەڵدا فەرمون. کەچوە دەرێ، عائیشە گوتی: ئەبوبەکر هاتە ژورێ، لەبەری هەڵنەستای و گوێت نەدایێ، پاشان عومەر هاتەژورێ، لەبەری هەڵنەستای و گوێت نەدایێ، پاشان عوسمان هاتە ژورێ، هەستایەوە دانیشتی و جل و بەرگت ڕێك خست، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "ألا استحي من رجل تستحي منه الملائكة ئەدی شەرم لەپیاوێك نەکەم کەفریشتەکان شەرمی لێ دەکەن".

# تواناکانیان

## توانای شێوەگۆڕینیان:

خوای گەورە ئەو توانایەی بەفریشتان بەخشیوە کەشێوەی خۆیان بۆ شێوەی دیکە بگۆڕن. خوای گەورە کە جیبریلی بۆ لای مەریەم هەنارد لەوێنەی مرۆڤێك ناردی: ﴿ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذْ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا، فَاتَّخَذَتْ مِنْ دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا، قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَانِ مِنْكَ إِنْ كُنتَ تَقِيًّا، قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا: لەم کتێبەدا یادی مەریەم بکە. ئەو دەمەی لەخانەوادەی جیابۆوەو، لەلای خۆرهەڵاتی بەیتولمەقدیس جێگیر بو و، پەردەیەکی لەنێوان خۆی و ئەواندا گرت، لەو دەمەدا ڕۆحی خۆمان ناردە لای، جا بۆ وی خۆی بەشێوەی مرۆڤێکی تەواو ڕانواند، مەریەم ترسا و گوتی: لەترسی تۆ پەنادەبەمە بەرخودای بەخشەر، ئەگەر خۆپارێزو بەتەقوای، گوتی: من ڕەوانەکراوی پەروەردگارتم، هاتوم تاکوڕێکی پاکت پێ ببەخشم ﴾ سورة مريم/١٦-١٩.

فریشتە لەشێوەی ئادەمی هاتنە لای ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ و، نەیزانی کەفریشتەن، تا خۆیان لێ ئاشکرا کرد، پێشتریش ئەو ئایەتانەمان باس کرد کە لەو مەوسەلەیە دەدوان.

هەروەها فریشتە لەوێنەی لاوچاکی ڕەنگ و ڕوجوان هاتنە لای لوط پێغەمبەر ﷺ ، لوط خەمی کەوتەبەرو ترسی لێنیشت لەئاست قەومەکەی بەرامبەر بەمێوانەکانی، چونکە قەومەکەی ئەهلی خراپەو بەدکاری بون و

توخنی نێرینان دەکەوتن ﴿ ولما جاءت رسلنا لوطاً سيء بهم. وضاق بهم زرعاً .

وقال هذا يوم عصيب: وەکاتێك ڕەوانەکراوەکانی ئێمە هاتنە لای لوط، بەهاتنیان دڵ تەنگ و پەرێشان بو، گوتی ئەمرۆ ڕۆژێکی سەختە ﴾ سورة هود/٧٧.

ئیبنو کەثیر دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێ: (فریشتەکان لەشێوەی لاوی قۆزو جوان خۆیان نیشان دان، تا تاقی یان بکەنەوەو بیانئەزمونن. هەتاکو بیانو و حوجەتیان لەسەر دروست بێ، ئەوسا خوای گەورە، بەدەسەڵات و توانای بێپایانی خۆی لەنێوی بردن)، (البداية والنهاية ١/٤٣) .

جیبریلیش بەچەندین شێوەو سیفەتی جیاجیا دەهاتە لای پێغەمبەرﷺ هەندێك جار لەوێنەوی دەحیەی خەلیفەی کەلبی دەهات کەهاوەڵێکی قۆزو شێوە جوان بوو، جاریش هەبو لەوێنەی عارەبێکی چۆل نشین دەهات. زۆریش لەهاوەڵان ﷺ جیبریلیان دەدیت، کەبەو شێوانە دەهاتە لای پێغەمبەرﷺ.

هەروەك لەهەردو صەحیحاندا هاتوە لەعومەری خەطابەوە هاتوە، دەڵێ: کاتێك ئێمە لەلای پێغەمبەری خوا دانیشتبوین، پیاوێکمان لێ بەدیارکەوت. جل و بەرگی زۆر سپی بو موەکانیشی زۆر ڕەش بون، شونی سەفەری پێوە دیارنەبو، کەسیش لەئێمە نەیدەناسی، لەلای پێغەمبەرﷺ دانیشت و، چۆکەکانی گەیاندە چۆکەکانی پێغەمبەر ﷺ، هەردو لەپی خۆی لەسەر ڕانەکانی پێغەمبەرﷺ داناو گوتی: ئەی موحەممەد لەبارەی ئیسلامەوە هەواڵم بدێ، لەفەرمودەکەشدا هاتوە، کە لەبارەی ئیمان و کارچاکی و، ڕۆژی دوایی و نیشانەکانی، پرسیاری لەپێغەمبەرﷺکردوە. پاشان پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمون، ئەوەی هات پرسیارەکانی کرد جیبریل بو، بۆ هەندێ هاتبو هاوەڵان فێرە دینی خوا بکا.

هەروەها جارێك عائیشە پێغەمبەرﷺی دیت دەستی دانابوە سەر پاڵی ماینەکەی دەحیەی کەلبی و قسەی لەگەڵ دەکرد. کەعائیشە لەو بارەیە لێی پرسی، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "ذاك جبريل يقرئك الســلام: ئەویان جیبریل بو و، سەلامیشت لێدەکا". (اخرجه احمد في مسنده وابن سعد في الطبقات باسناد حسن).

پێغەمبەریش ﷺ باسی ئەو پیاوەی بۆ کردوین کەنۆهەت و نۆ کەسی کوشتبو. کاتێك بەژیوانی و تۆبەکاریەوە کۆچی کرد. لەنیوەی رێی ئەو شوێنەی کۆچی بۆ دەکرد، مردنی گەیشتێ. فریشتەی رەحمەت و فریشتەی سزا لەسەری بوە کێشەیان، جا فریشتەیەکیان کردە ناوبژیوان کەلەوێنەی ئادەمیزادێك هاتە لایان، پێغەمبەر ﷺدەفەرموێ: "فجاءهم ملك في صورة آدمي فجعلوه بينهم. فقال قيسوا مــابين الارضــين فــالى ايتــهما كــان ادنى فــهو لــه: فریشتەیەکیان لەوێنەی ئادەمیزاد هاتە لاو، کردیانە ناوبژیوانیان. جا پێی گوتن نێوان هەردو لایان بپێون. لەکامە لا نێزیکتر بو، لەگەڵ ئەو لادایە".

گومانیش لەوەدا نیە کەئەوان بەفەرمانیخوا ناوبژیان داوەتە دەست ئەو فریشتەیە و، خوای گەورەش ئەو فریشتەیەی لەوێنەی ئادەمیزادێك بۆ ناردن. چیرۆکەکەش لەصەحیحی موسلیم لەبابی تۆبەدا هاتوە.

لەچیرۆکی ئەو سێ کەسەی ئیسرائیلیان کەخوای گەورە تاقی کردنەوەو یەکێکیان بەڵەك وئەوی دی کەچەڵ و ئەوی دیکەیان کوێرە بو. باسی ئەوە دێ کە فریشتە خۆی هێناوەتە سەر شێوەی هەریەکە لە کەچەڵ و بەڵەك و کوێرەکە.

## خێرایی مەزنیان:

مەزنترین خێرایی کەمرۆڤ پێی ئاشنابێ خێرایی روناکیە، کەلەیەك چرکەدا (١٨٦) هەزار میل دەبڕێت. بەڵام خێرایی فریشتان لەسەرو ئەو

خێراییەوەیەو، بەپێوەرەکانی مرۆڤ ناپێورێ، جار هەبوە یەکێك بۆ پرسیارکردن دەهاتە لای پێغەمبەر ﷺ، هێشتا بەتەواوی لەپرسیارەکەی نەدەبۆوە کەجیبریل لەپەروەردگاری خاوەن دەسەڵات و پاك وبەرزەوە وەڵامەکەی بۆ دەهێنا. ئەمڕۆش ئەگەر مۆشەك و کەشتی ئاسمانی هەبن بەخێرایی روناکی بڕۆن. ئەوا (ملیارێك) ساڵی ڕوناکیان گەرەکە تا دەگەنە هەندێك هەسارەی نێو ئاسۆی ئەم گەردونە فرەوان و پان و بەرینە.

## زانستی فریشتان:

فریشتەکان زانستێکی زۆر و فرەوانیان هەیە کەخوای گەورە فێری کردون. بەڵام ئەو توانایەیان نیە کەبۆ شت ناسینەوە بەمرۆڤ بەخشراوە ﴿ وَعَلَّمَ آدَمَ الاَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلاَء إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ، قَالُوا سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ: ئەوسا خودا هەمو ناوەکانی فێری ئادەم کرد. لەپاشان ئەوانەی بەفریشتان نیشان داو، فەرموی: ئەگەر ڕاست دەڵێن، ناوەکانی ئەوانەم پێ بڵێن، فریشتان گوتیان: تۆ بێ خەوش و پاکی، بێجگە لەوەی تۆ فێرت کردوین هیچیتر نازانین، بەڕاستی تۆ زۆر زاناو دانای ﴾ سورة البقرة/٣١-٣٢.

جا مرۆڤ بەوەی جیاترە کە توانای ناسینەوەی شتەکان ودۆزینەوەی سوننەتەکانی بونەوەری هەیە. هەرچی فریشتەکانن زانستەکانیان یەکسەر لەخوای بەرزەوە وەردەگرن.

بەڵام ئەو زانستەی خوای گەورە ئەوانی فێرکردوە لەوە زیاترە کەمرۆڤ دەیزانێ. لەوزانستانەی فریشتەکان پێ ئاشنان زانستی نوسینە، ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ، كِرَامًا كَاتِبِينَ، يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ: پارێزەرانێك لەسەر ئێوە هەن،

نوسەرانی بەرزو بەڕێز. هەرچی ئێوە بیکەن ئەوان دەیزانن ﴾ سورة الانفطار ١٠/١٢. ئەو مەسەلەیەش زیاتر لەباسی (فریشتەو مرۆڤ) ڕون دەبێتەوە.

## مشتومڕی نێوان فریشتان لەجیهانی بالا:

فریشتەکان لەنێوان خۆیاندا وتوێژ دەکەن دەربارەی ئەو فەرمانانەی سروشی پەروەردگاریان کەلەوان دیارنیە. لەسونەنی تیرمیذی و موسنەدی ئەحمەد، لەئیبنی عەبباسەوە هاتوەکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: "أتاني الليلة ربي تبارك وتعالى في احسن صورة، فقال: يامحمد هل تدري فيم يختصم الملأ الاعلى؟ قلت: لا، فوضع يده بين كتفي، حتى وجدت بردها بين ثديي، فعلمت مافي السموات والارض. فقال: يامحمد!هل تدري فيم يختصم الملأ الاعلى؟ قلت: نعم، في الكفارات والدرجات، والكفارات: المكث في المساجد بعد الصلوات، والمشي على الاقدام الى الجماعات، واسباغ الوضوء في المكاره.

قال: صدقت يا محمد!ومن فعل ذلك عاش بخير، ومات بخير، وكان من خطيئة كيوم ولدته امه.

وقال: يامحمد اذا صليت فقل: اللهم اني اسألك فعل الخيرات، وترك المنكرات، وحب المساكين، وأن تغفرلي، وترحمني، وتتوب علي واذا أردت بعبادك فتنة فاقبضني اليك غير مفتون.والدرجات: افشاء السلام، واطعام الطعام والصلاة بالليل والناس نيام: ئەمشۆ پەروەردگاری پاك و بەرزم لەجوانترین وێنەدا هاتە خەون و، فەرموی: ئەی موحەممەد، ئایا دەزانی جیهانی بالا لەبارەی چی مشتومڕیانە؟ گوتم: نەخێر، جا دەستی پیرۆزی خۆی خستە نێوان هەردو شانم، تاکو هەستم بەفێنکایی کرد لەنێوان هەردو مەمکم. ئەوجا هەرچی لەئاسمانەکان وزەویدا هەبو هەموم زانی. جا فەرموی: ئەی موحەممەد! ئایا دەزانی جیهانی بالا لەسەرچی مشتومڕیانە؟گوتم: بەڵێ، لەبارەی گوناه بەرەکان و پایەکان، گوناه لابەرەکانیش بریتین لە: مانەوە لەمزگەوتان پاشی نوێژەکان و، بەپێ

ڕۆیشتن بۆ جەماعەتەکان و، دەستنوێژی تەواو هەڵگرتن لەشوێنکاتی زەحمەتدا. فەرموی: ڕاستت گوت ئەی موحەممەد!هەرکەسێکی ئەو کردارانە بکا، لە خێردا دەژی و بەخێر دەمرێ‌و، لەگوناهەکانیش پاك دەبێتەوە وەکو ئەو ڕۆژەی تێیدا لەدایك بوە. هەروەها فەرموی: ئەی موحەممەد ئەگەر نوێژت کرد بڵێ: خودایە، لێت دەپاڕێمەوە، کاری چاك بکەم و، واز لە خراپەکاری بێنم و، هەژارانم خۆش بوێن و، تۆش لێم خۆش بی و، ڕەحمم پێ بکەی، ژیوانیم لێ قبول کەی و، ئەگەر ویستیشت بەندەکانت بئەزمونی و تاقییان کەیتەوە گیانی من بکێشی بەبێ ئەوەی توشی فیتنەبم. پایەکانیش بریتین لە: سلاوبلاوکردنەوەو، نان بدەیی و، نوێژی شەوێ لەکاتێکی خەڵك نوستون " (صحيح الجامع ١/٧٢).

ئیبنی کەثیر لەبارەی ئەم فەرمودەیە دەڵێ: (ئەمە فەرمودە ناودارەکەی خەونە، ئەوەی بڵێ لەکاتی بەئاگایی بوە، بەهەڵەدا چوە، بەچەند ڕێگایەك لەسونەنەکاندا هاتوە، ئەم فەرمودەیە تیرمیذی لەفەرمودەی جوهضومی عەبدوڵلای یەمامی دەگێڕێتەوە) .

حەسەن دەڵێ: صەحیحە، بەلام ئەم مشتومڕە، ئەوە نیە کەلەقورئانی پیرۆزدا هاتوە کەدەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِي مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَى إِذْ يَخْتَصِمُونَ، إِنْ يُوحَى إِلَيَّ إِلَّا أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ: پێکەوە لەبابەت ئادەم دژایەتی و مشتومڕیان بو، من هەواڵم لەتاقمی جیهانی بالا نەبو. هیچ بەمن وەحی ناکرێ مەگەر بەو هۆیە نەبێ کە ترسێنەرێکی ئاشکراو ڕونکەرەوەم ﴾ سورة ص/٦٩-٧٠.

دژایەتی ومشتومڕکردنی فەرمودەکە، پێغەمبەرﷺ ڕاڤەی کردوە. هەرچی ئەوەی قورئانی پیرۆزیشە بەئایەتەکانی دوای خۆی ڕاڤە کراوە ﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِينٍ،فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي

فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ، فَسَجَدَ الْمَلاَئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ، إِلاَّ إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنْ الْكَافِرِينَ: ئەو دەمەی پەروەردگارت بەفریشتەكانی فەرمو: بەڕاستی مرۆڤێك لەقوڕ ئافەرید دەكەم، جا هەركاتێك تەواوم كردو ڕۆحی خۆم بەبەری داكرد، ئێوە هەمو سوژدەی سڵاوی بۆ ببەن. جا هەمو فریشتەكان بەتێكڕا سوژدەیان بۆ برد. تەنها ئیبلیس نەبێ، كە خۆی بەزل دانـاو بەزلفیزی لەكافران بو ﴾ سورة ص/٧١-٧٤.

لێرەدا ئاشكرا دەبێ كە مشتومڕەكەی لەقورئانی پیرۆزدا باسی كراوە لەبارەی ئادەم ﷺ ەوە بوە، كە ئیبلیس سوژدەی بۆ نەبردوەو بڕوبیانوی بۆ پەروەردگاری هێناوەتەوەو خۆی پێ چاكتر بوە. (بگەڕێوە بۆ ڕاڤەی ئیبنیكەثیر ٧٣/٦-٧٤).

## لەهەمو كاروبارێكیاندا ڕێكوپێكن:

فریشتەكان لەپەرستشیاندا ڕێكوپێكن، پێغەمبەریش ﷺ هانی داوین تا لەهەندێ چاویان لێ بكەین كاتێك فەرمویەتی: "ألا تصفون كما تصف الملائكة عند ربها؟: ئایا واریز نابن كە فریشتەكان لەلای پەروەردگاریان ریزدەبن؟" گوتیان: جا ئەوان چۆن لەلای پەروەردگاریان ریز دەبن؟ فەرموی: یكملـــون الصف الاول فالاول یتراصون في الصف: ریزی یەكەم تەواو دەكەن ئەوجا دەچنە ریزەكی دی و خۆیان لەریزەكاندا ڕێك دەخەن" (رواه الجماعة الا البخاري). خوای گەورەش بەوە زێتری داناوین لەئۆمەتەكانی تر كە ڕیزەكانمان وەك ریزەكانی فریشتان وایە (جعلـت صفوفنـا كصفـوف الملائكــة) . ئەم فەرمودەیەش لەصەحیحی موسلیمدا هاتوە.

هەروەها لە ڕۆژی دواییدا فریشتەكان پۆل پۆل بە ڕێكوپێكی دێـن ﴿ وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا: پەروەردگارت دەگات و، فریشتە پۆل پۆل

**ئاماده دەبن ﴾** سورة الفجر/ ٥٥. **بەڕێزیش لەبەردەستانی خوای بەرز دەوەستن:**

﴿ يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا لَا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا: **ڕۆژێ جیبریل و فریشتان بەڕێز رادەوەستن و هیچیان قسەناکەن، مەگەر ئەوەی کەخودای میهرەبان مۆڵەتی بداتێ و ئەویش بەڕاستیو چاکە بئاخێوێ** ﴾ سورة النبأ/ ٣٨.

**بڕوانە وردەکاریان لەپیادەکردن و جێبەجێ کردنی فەرمانەکان. لەصەحیحی موسلیم و موسنەدی ئەحمەد، لەئەنەسەوە ﷺ هاتوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "آتي باب الجنة فأستفتح. فيقول الخازن: من أنت؟ فأقول: محمد، فيقول بك امرت الا افتح لاحد قبلك: دێمە بەردەرگای بەهەشتێ و داوا دەکەم لێمی بکەنەوە، دەرگەوانی بەهەشت دەڵێ تۆ کێی؟جا دەڵێم موحەممەدم، ئەو دەڵێ: فەرمانم بەتۆ پێ کراوەو لەپێش تۆ نابێ بۆ کەسێکی دیکەی بکەمەوە".**

**دەکرێ زیاتر وردەکاریان لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکاندا تێبینی بکەین ئەگەر چاو بەفەرمودەی ئیسرێ دا بگێڕین. کاتێك جیبریل لەهەر ئاسمانێك مۆڵەت دەخوازێ و تالێی نەپێچنەوە دەرگەی بۆناکەنەوە.**

## ڕامانێك لەسروشتی فریشتان

فریشتەکان مۆرکیان بەتاعەتی خواوە گرتوە، توانای یاخی بون و نافەرمانیان نیە ﴿ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ: هەرچی خوا پێیان بسپێری نافەرمانی ناکەن و هەرئەوەی دەکەن کە ڕاسپێردەیانە ﴾ سورة التحريم/٦.

جا لەبەر ئەوەی وازهێنانیان لەگوناه و یاخیبون و، گوێرایەڵی و تاعەتکاریان، لەپێکهاتەو سروشتیان دایە. پێیەوە ماندو نابن و کۆششی ناوێ، چونکە شەهوەت و ئارەزوی چڵێسیان نیە.

ڕەنگە هەر ئەو هۆکارەش بێ وای لەکۆمەڵێك زانایان کردبێ بڵێن فریشتەکان ئەرکبارنین و ناچنە ناو جوغزی بەڵێنەکانی پاداش و سزاوە (لوامع الانوار ٢/٤٠٩).

ئێمە دەتوانین بڵێین: فریشتەکان بەهەمان ئەوان ئەرکان ئەرکبار نەکراون، کەلەئەستۆی ئادەمیزاد دایە، هەرچی ئەو گۆتەیەشە کەدەڵێ: فریشتەکان بەڕەهایی ئەرکبارنین، ڕەت دەکرێتەوە. چونکە ئەوان فەرمانی پەرستش وتاعەتیان پێکراوە ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ: فریشتەکان لەپەروەردگاریان، کەبەسەریاندا حاکمە دەترسێن و، ئەسپاردەی خۆیان ئەنجام دەدەن ﴾ سورة النحل/٥٠.

هەروەك ڕونە لەئایەتەکەدا دەڵێ لەپەروەردگاریان دەترسێن، ترسانیش جۆرە ئەرکێکی شەرعیەو، بەڵکو بەرزترین جۆرەکانی بەندایەتیە. هەروەك دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ وَهُمْ مِنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ : فریشتەکان لە بیمی مەزنێتی خودا لە ترسدان ﴾ سورة الانبياء/٢٨.

**پلەو پایەی فریشتان:**

چاکترین وەسف بۆ فریشتان ئەوەیە کەبەندەی خودان، بەڵام بەندەی ڕێز لێنراون. پێشتریش ئاماژەمان بۆئەوە کرد، کەبانگەشەی هاوبەش دانەران لەوەی کە فریشتان کچی خوان. بانگەشەیەکی پوك و بەتاڵی دور لەڕاستی یە، خوای گەورەش بێژەرانی ئەو گۆتنەی لەچەندین جێدا وەدرۆ خستۆتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَانُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ، لاَ يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُمْ بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ، يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يَشْفَعُونَ إِلاَّ لِمَنْ ارْتَضَى وَهُمْ مِنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ، وَمَنْ يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَهٌ مِنْ دُونِهِ فَذَلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ: ئەوانە گوتیان؛ خوای خاوەن میهرو بەزەیی منداڵی بۆ خۆی هەڵبژاردوە کە فریشتەن، پاکی و بێخەوشی بۆ خوا، بەلکو ئەو فریشتانە بەندەی شیاوی خودان، بەپێش قسەی خوا ناکەون و، بەفەرمانی خودا کار دەکەن. خودا کردەی ئێستاو داهاتوی ئەوانە دەزانێ و هەروا ڕابردوشیان دەزانێ و، ئەو فریشتانە تکاو شەفاعەت ناکەن مەگەر بۆ کەسێك کەخوا لێی رازیە تکای بۆبکەن و، فریشتەکان لە بیمی مەزنێتی خوای گەورە لەترس دان. هەرکەسێکیش لەوان بڵێ: من پەرستراوێکی دیکەم جگە لەخوا، بەدۆزەخ سزای دەدەین. ئا بەم شێوەیە سزای ستەمکاران دەدەین ﴾ سورة الانبياء/٢٦-٢٩.

فریشتەکان بەندەی وان هەمو سیفەتەکانی بەندایەتی‌یان تێدایە، ڕاژەکارن و ڕێکارەکان جێبەجێ دەکەن، زانستی خوا دەوری داون، ناتوانن فەرمانەکان ببەزێنن، هەروەك ناتوانن پێچەوانەی ڕێکارەکانی سەر شانیان رەفتار بکەن. دەترسێن و باکیان هەیە، گریمان یەکێکیشیان لەدۆخی خۆی تێپەڕی، خوای گەورە لەپای هەڵگەرانەوەکەی سزای دەدا.

**پاکیگاری:**

فریشتەکان یادی خوای بەرز دەکەن و، مەزنترین یادکردنیشیان پاکیگارییە. هەڵگرانی عەرش تەسبیحاتی خوا دەکەن: ﴿ الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ: ئەوانەی عەرش هەڵدەگرن و ئەوانەی لەدەوری دان پاکی و ستایشی خوا دەکەن ﴾ سورة غافر/٧.

هەروەك سەرجەم فریشتەکانی پاکیگاری وی دەکەن: ﴿ وَالْمَلَائِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ: فریشتەکان هەمیشە پاکیو ستایشی پەروەردگاری خۆیان بەجیٚ دیٚنن ﴾ سورة الشورى/٥. تەسبیح و پاکیکردنیان بۆ خوای گەورە بەردەوام وهەمیشەییەو نە بەشەوو نە بەڕۆژ پچڕانی بۆ نیە ﴿ يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ: شەوو ڕۆژ پاکیگاری خوا دەکەن و سست و ماندوش نابن ﴾ سورة الانبياء/٢٠.

جا لەبەر زۆری پاکیکردنیان، ئەوان بەپاکیگاری ڕاستەقینە دادەنریٚن و مافی خۆیانە شانازی پیٚوە بکەن و خۆیانی پیٚ هەڵدەن: ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ، وَإِنَّا لَنَحْنُ الْمُسَبِّحُونَ: بەڕاستی ئیٚمە هەمومان بۆ فەرمانی خوا بەریز وەستاوین، وەبەڕاستی ئیٚمە تەسبیحات دەکەین و پاکی و بیٚخەوشی خوا دەڵیٚین و پاکیگاری ڕاستەقینە بن ﴾ سورة الصافات/١٦٥-١٦٦.

بۆیەش هیٚندە زۆر خەریکی تەسبیحن، چونکی پاکیکردن چاکترین زیکرو یادی خوایە، موسلیم لەصەحیحەکەیدا لەئەبوذەر دەگیٚڕیتەوە، دەڵیٚ: لەپیٚغەمبەرﷺ یان پرسی: کامە یادی خودا چاکترینە؟ فەرموی: (ما اصطفی

الله لملائكته او لعبـــاده: ســبحان الله وبحمــده: ئەو يادەی كە خوای گەورە بۆ فریشتەكانی خۆی یا بۆ بەندەكانی خۆی هەڵیبژاردوە؛ سبحان الله وبحمــــده: پاكی و بێخەوشی و ستایش بۆ خودا).

## نوێژی فریشتان:

لەپێشـدا ئـەو فەرمودەیـەمان هێنـاوە، كـە تێیـدا پێغەمبـەر ﷺ هـانی هـاوەڵانـی خۆی دەدا لە ڕیزبونی نوێژێدا چاو لـە فریشـتەكـان بكـەن: (ألا تصفون كما تصف الملائكة عند ربها ؟: ئایا ڕیزنابن وەك چۆن فریشـتەكان لـەلای پـەروەردگاری خۆیـان پـۆل پـۆل ڕیزدەبـن). كەپرسیاریشـی لێكـرا لەبابـەت چۆنیەتی ڕیزبونیان، فەرموی: "یتمون الصف الاول فالاول. ویتراصون في الصـف ریـزی یەكـەم تەواودەكـەن دوایـیٚ ئـەوی دیو، لـەڕیزدا خۆیـان ڕێـك دەخـەن" (رواه البخاري) .

لـەقورئانی پیرۆزیشـدا لەفریشـتانەوە هـاتوە ﴿ وَإِنَّـا لَنَحْـنُ الصَّـافُونَ: بەڕاسـتی ئێمـە هـەمومان بـۆ فـەرمانی خـودا بـەڕیز وەسـتاوین ﴾ سـورة الصافـات/١٦٥. لەنوێژیشـدا ڕادەوەستن و كڕنوش دەبەن و سوژدە دەبەن. لـە (مشـكل الاثـار)ی طـەحاوی و (المعجـم الكبـير)ی طەبـەرانیدا، لەحـەكیمی حوزامەوە هاتوە دەڵیٚ: (پێغەمبەر ﷺ لەناو هاوەڵانی دابو، كە پێی فـەرمون: "أتسمعون ما أسمع؟: ئەوەی ئەمن دەیبیستم ئەنگۆ گوێتان لێیە". گوتیان: هیچ نابیستین، فەرموی: "أني لأسمع أطيط السماء. وما تلام ان تئط. وما فيها موضع شبر الا وعليـه ملـك. سـاجد اوقـائم: من وادەنگی ئاسمانـیٚ دەبیسـم، لۆمـەو سەركۆنەش ناكریٚ كەدەنگی لێوە دیٚ، لەكاتێكدا تەنانـەت جیٚ بستێك نیە مەگەر فریشتەیەكی لەسەر بیٚ كەلەسوژدەدایە یا بەپێوەیەو ڕاوەستاوە ."

ئەلبانی لەبارەی ئەم فەرمودەیە دەڵیٚ: لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحە (سلسلة الاحاديث الصحيحة حديث رقم ٨٥٢) .

## حەج کردنیان:

فریشتەکان کەعبەیەکیان لەئاسمانی حەفتەمین هەیە حەجی بۆدەکەن، ئەو کەعبەیە ئەوەیە کەخوای گەورە بەخانوی ئاوەدان (البیت المعمور) ناوی دێنێ،و لەسورەتی (الطور)دا سوێندی پێ دەخوات، کەدەفەرمی ﴿ وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ ﴾ سورة الطور /٤.

ئیبنی کەثیر لەڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ: (لەهەردو صەحیحان دا هاتوە کەپێغەمبەر ﷺ لەفەرمودەی شەوڕۆییدا، پاش تێپەڕینی لە هەفتەمین ئاسمان، دەفەرموێ: "ثم رفع بي الى البيت المعور. واذا هو يدخله كل يوم سبعون ألفاً لايعودون اليه آخر ما عليهم: ئەوجا بەرزکرامەوە بۆ بەیتولمەعمور، کەڕۆژانە هەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناویەوەو، جارێکی دیکە بۆی ناگەڕێنەوەو ئەمەش دوا حالی ئەو فریشتانەیە".

جا فریشتان خواپەرستی تێدا دەکەن، تەواف بەدەوردا دەکەن، هەروەکو زەوی نشینیش بەدەوری کەعبەی خۆیاندا دەسوڕێنەوە. بەیتولمەعمور کەعبەی فریشتەکانی ئاسمانی هەفتەمە، هەر بۆیەشە پێغەمبەر ﷺ ئیبراهیم‌ﷺی دیت پشتی خۆی بەبیتولمەعمور دابو. چونکە بنیات نەری کەعبەی زەویەو، پاداشیش لەچەشنی کردەوەیە) . هەروەها ئیبنیکەثیر باسی ئەوەی کردوە، کەبیتولمەعمور لەراست کەعبەیە، واتە ڕاستەخۆ لەسەریەوەتی و، ئەگەر بکەوتە خوارێ دەکەوێتە سەر کەعبە، باس لەوەش دەکا هەر ئاسمانێك خانوێکی تێدا یە دانیشتوانی خوا پەرستی تێدا دەکەن و، لەنوێژدا ڕوی تێ‌دەکەن. ئەوەی لە ئاسمانی دونیاشە پێی دەگوترێ: بەیتولعیززە.

ئەوەی کە ئیبنی کەثیر هێناویەتیەوەو دەڵی بەیتولمەعمور لەڕاست کەعبەیە لەعەلی ئەبوطالیبەوە دەیگێڕنەوە، ئیبنی جەریر لەڕێگای خالیدی

کـــوڕی عەرعـــەرە تـــەخریجی کـــردوە، کـــەپیاوێك بەعـــەلی ﷺ ی گـــوت: بەیتولمەعمور چیە؟ گوتی: خانوێکە لەئاسماندا پێی دەگوترێ (الضـــراح) لەســـەرەوەڕا دەکەوێتـــە ڕاســـت کەعبـــە، حورمـــەت و ڕێـــزی ئـــەو خـــانوە لەئاسماندا، وەکو حورمـەتی کەعبەیە لەزەوی هـەمو ڕۆژێـك هـەفتا هـەزار لەفریشتان نوێژی تێدا دەکەن و، هەرگیز جارێکی تر بۆی ناگەرێنەوە).

شێخ ناصیروددینی ئەلبانی لە (الاحادیث الصحیحـة ١/٢٣٦)دا لـەبارەی ئـەم فەرمودەیە دەڵێ: پیاوەکانی متمانـەدارن جگـە لـەخالیدی کـوڕی عەرعـەرە کەداپۆشـراو (مســتور)ە پاشـان دەڵـێ: فەرمودەیـەکی پاڵپشـتی هەیـە بەمورسـەلی و صـەحیحی لەپێغەمبـەرﷺ ەوە هـاتوە، لەگێڕانـەوەی قـەتادە، دەڵێ: بۆیان باس کردوین، کەپێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك بەهاوەڵانی خۆی گوت: "هل تدرون ما البيت المعمور؟ قالوا: الله ورسوله اعلم. قال: فانه مسجد في الســـماء، تحته الكعبة، لو خر لخرَّ عليها...: ئایا دەزانن بەیتولمەعمور چەیە؟ گوتیان خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن. فەرموی: ئـەوە مزگەفتێکـە لـەئاسمانێدا، کەعبـەی لەژێری دایە، ئەگەر بەربێتەوە بەسەرکەعبەدا بەردەبێتەوە".

پاشـان ئـەلبانی توێـژەر دەڵـێ: پوختـەی قسـان، ئـەو زیـادەی (حیـال الكعبة: لەراست کەعبەدا) بەکۆی ڕێگاکانی چەسپاوە.

## ترس و پەروایان لەخوای گەورە:

لەبەرئـەوەی فریشـتەکان زۆر چـاك پـەروەردگاری خۆیـان دەناسـن، بۆیـە بەمـەزن گرتـن و، تـرس و پـەروایان لەئاستیدا، زۆر مەزنـە. خـوا دەربارەیـان دەفەرموی: ﴿ وَهُمْ مِنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ: فریشـتەکان لـە بیمـی مـەزنێتی خـودا لەترسدان ﴾ سورة الانبياء/٢٨.

ئـەوەی زۆر ترسـانی فریشـتان لـەخوای کاربـەجێ ڕون دەکاتـەوە، ئـەو فـەرمودەیەکـــە ئەلنـەواســـی کـــوڕی ســەمعـــانﷺ دەیگێڕتـــەوە دەڵـــێ:

**پێغەمبەرﷺ فەرموی:** "اذا اراد الله ان يوحي بالامر تكلم بالوحي اخذت السموات منه رجفة. او قال رعدة شديدة خوفاً من الله عز وجل. فاذا سمع ذلك اهل السموات صعقوا وخروا لله سجداً. فيكون اول من يرفع رأسه جبريل عليه السلام . فيكلمه الله تعالى من وحيه بما أراد ...: **کاتێك خوا دەیەوێ سروش بەفەرمانێك بکات. بە سروش دەئاخێوێ. ئاسمانەکان لەرز دەیانگرێ، یان فەرموی هەژانێکی توند دادەگرن لەترسی خوای بەرزو دەسەلاتدار. جاکە ئاسمان نشینەکان ئەوە دەبیەن هەمو دەتاسێن و بۆ سوژدە بۆ خوا دادەنەون. یەکەمین کەسیش سەری بەرزکاتەوە جیبریلە عليه السلام، جا خودای بەرز بەچی بیەوێ لەسروشی خۆی، بەوە لەگەڵی دەئاخێوێ** " (رواه ابن جرير وابن خزيمة والطبراني وابن ابي حاتم واللفظ له).

**هەروەها طەبەرانی لە (المعجم الاوسط)دا بەئیسنادێکی چاك لەجابیرەوەرضي الله عنه کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:** (مررت ليلة أسري بي بالملأ الاعلى. وجبريل كالحلس البالي من خشية الله تعالى: **ئەو شەوەی شەورۆییم پێ کرا بەجیهانی بالآدا تێپەڕیم، جیبریل وەکو بەڕێکی داڕزاو بو لەترس و بیمی خوای بەرز** ) (صحيح الجامع ٥/٢٠٦).



# فریشتەکان و ئادەم

## پرسیاری فریشتان لەبابەت حیکمەتی ئەفراندنی مرۆڤ:

کاتێك خودای پاك و بێخەوش ویستی ئادەم ئافریدەبکات، فریشتەکانی لەو مرازەی خۆی ئاگادار کرد، ئەوانیش لەبارەی حیکمەتەکەی لێیان پرسی، چونکە دەیانزانی گەندیکاریو، خوێن ڕشتن و، یاخیبون و، کوفر دەکەوتە نێو نەوەی ئادەم. جا خوای گەورە هەواڵی دانێ کە لەپشت ئافەریدەکردنی ئادەم حیکمەت گەلێ هەن ئەوان نایزانن: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لا تَعْلَمُونَ: کاتێ پەروەردگاری تۆ بەفریشتانی گوت: من جێنشینێك لەزەویدا دادەنێم، فریشتەکان گوتیان: ئایا کەسێك لەزەوی دەکەیتە جێنشین کە گەندی و گێرەشێوێنی و خوێنڕێژی بکا؟ ئێمە وا پاکی و بێخەوشی و ستایش وپەسن و پیرۆزی تۆ دەکەین، پەروەردگار فەرموی: من شتانێك دەزانم کەئێوە نایانزانن ﴾ سورة البقرة/ ٣٠.

## سوژدەی فریشتان بۆ ئادەم لە پاش ئەفراندنی :

خودا فەرمانی بەفریشتان کرد سوژدە بۆ ئادەم ببەن، کاتێ ئافەریدکردنی تەواو بو و گیانی وەبەرداکرا: ﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِينٍ، فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ: ئەو دەمی

پەروەردگارت بەفریشتەکانی فەرمو: بەڕاستی مرۆڤێك لەقوڕ ئافەریددەکەم. جا کاتیَ تەواوم کردو ڕۆحی خۆم وەبەری داکرد، ئێوە هەمو سوژدەی بۆببەن ﴾ سورة ص/٧١-٧٢.

ئەوجا فریشتەکان هەمو فەرمانی خودایان جێبەجێ کرد تەنیا ئیبلیس نەبیَ: ﴿ فَسَجَدَ الْمَلائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ، إِلاَّ إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنْ الْكَافِرِينَ : جا هەمو فریشتەکان بەتێکرا سوژدەیان بۆ برد. تەنها ئیبلیس نەبیَ، کەخۆی بەزل داناو، لەکافران بو ﴾[1] .سورة ص/٧٣-٧٤).

## ڕابەری و ئاراستەکردنی فریشتان بۆ ئادەم:

لەئەبوهورەیرە ﷺ دەڵیَ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "خلق الله آدم على صورته. طوله ستون ذراعاً. فلما خلقه قال: اذهب فسلم على اولئك. وهم نفر من الملائكة جلوس. فاستمع مايحيونك فانها تحيتك وتحية ذريتك. فذهب. فقال: السلام عليكم. فقالوا: (السلام عليك ورحمة الله) قال؛ (فزادوه ورحمة الله): خوا ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی ئافەریدەکرد، باڵای شەست باڵ بو، جاکە ئەفراندی پێی فەرمو: بڕۆ سڵاو لەوانێهیَ بکە، کەچەند فریشتەیەك بون دانیشتبون. ئەجا گویَ بدیَ چۆنت سڵاو لیَ دەکەن، ئەوە سڵاوی تۆو سڵاوی نەوەکانتە، چوە لایان و گوتی: السلام علیکم. ئەوان گوتیان: (السلام علیك ورحمة الله) دەفەرمیَ: ڕەحمەتی خودا (رحمة الله) یان بۆ زیاد کرد" (متفق علیه).

---

[1] ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە هەمو فریشتەکان سوژدەیان بۆ ئادەم بردوە، ئەمەش وەڵامە بۆ ئەوانەی دەڵێن تەنیا بەشێك لەفریشتان سوژدەیان بردوە. یان فریشتەکانی زەوی سوژدەیان بۆ ئادەم بردوە. ئەو شونەی دەشڵیَ هەر فریشتەی زەوی بون و دراوەتە پاڵ ئیبنیعەبباس نەناسران و دابڕانێکی تێدایە. بەڕای ئیبنیتەیمیەش ئەم ئایەتە دەقێکە هیچ جۆرە تەئویلێك هەڵناگریَ و پێچەوانەکردنی دروست نیە.

## شوشتنی تەرمی ئادەم لەلایەن فریشتانەوە:

کـە ئـادەم وەفـاتی کـرد منداڵـەکانی نـەیانزانی چـی لێ بکـەن، جـا فریشـتەکان فێریـان کـردن. لـە (مسـتدرک)ی حـاکیم و (المعجـم الاوسـط)ی طەبەرانیدا، بەسەنەدێکی صەحیح هاتوە، لە ئوبەی ﷺ لەپێغەمبەرﷺ: "لما توفي آدم غسلته الملائكة بالماء وتراً. وألحدوا له. وقالوا: هـــذه ســنة ادم في ولـــده: کەئادەم وەفاتی کرد، فریشتەکان چەند جارێکی تاك بەئاوێ شوشتیان و، لاگۆڕیان بۆ هەڵکەندو، گوتیان: ئەمە سوننەتی ئادەمە بۆنەوەو زاڕوڵانی خۆی " (صحيح الجامع ٥/٤٨).

هەروەها لە فەرمودە صەحیحەکاندا سەلماوە کەفریشتەکان شەهیدێکی ئەم ئۆمەتەیان شوشتوە، ئەویش حەنظەلەی کـوڕی عامیرە کـە لـە غـەزای ئوحود شەهید بو، چونکە پاش کوژرانی حەنظەلە، پێغەمبەر ﷺ بەیاوەرانی خۆی فەرمو: (ان صـــاحبكم تغســـله الملائكـــة. يعـــني حنظلـــة: وافریشـتەکان هاوەڵەکەتان دەشۆن، مەبەستی حەنظەلە بو). جا هاوەڵان لە هاوەسەرەکەیان پرسی، ئەویش گوتی: حەنظەلە کەگوێی لەبانگەوازی جەنگ بو، بەلەشی پیسەوە دەرچو. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لذلك غســــلته الملائكـــة: هەر بۆیە فریشتەکان شوشتیان) (رواه الحاكم، والبيهقي في السنن واسناده حسن كما يقول الالبـــاني) هەروەها ئیبنیعەساکیر بەسەنەدێکی صەحیح باس دەکا کەخێڵی ئەوس شانازیان بەوەی دەکرد کە حەنظەلەی شۆردراوی فریشتان لەوانە (الاحــاديث الصحيحة.حديث رقم ٣٢٦) .

## فریشتەکان و ئادەمیزاد

پەیوەندی فریشتان بەنەوەی ئادەم پتەو و بەهێزە، لەکاتی ئەفراندنی چاویان لێیەو، کەچاویش بەژیان هەڵدێنی، فریشتان ئەرکی پارستنیان دەخرێتە ئەستۆ. هەروەها هەر فریشتە لەخوداوە سروش بۆ ئادەمیان

دێنن و، چاودێری کردەوەو هەڵس و کەوتی دەکەن و، کەئەجەلی هات گیانی دەکێشن. ئەم باسەش بەشێوەیەکی ڕونتر دەتۆژینەوەو درێژەی پێ دەدەین.

## ڕۆڵی فریشتان لە پێکهاتنی مرۆڤ:

موسلیم لە صەحیحەکەیدا لەئەبوذەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لەپێغەمبەرﷺ م ژنەوت، دەیفەرمو: "اذا مر بالنطفة اثنتان واربعون ليلة بعث الله تعالى اليها ملكاً. فصورها. وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها. ثم قال: أي رب: ذكر ام انثى؟ فيقضي ربك مايشاء ويكتب الملك: ئەگەر چل و دو شەو لەپزدانی دایك بەسەر تۆم دا تێپەڕی ، خودای بەرز فریشتەیەکی بۆ دەنێری، وێنەی دەکێشێ، گوێ و چاو و پێست و گۆشت و ئێسکەکەی دەئەفرێنێ. پاشان دەڵێ: ئەی پەروەردگار: نێرینە یان مێینە ؟جا خودای پەروەردگار چی بوێ ئەوە دەخەملێنێ و فریشتەکەش دەینوسێ". هەروەها لەهەردو صەحیحی بوخاری و موسلیم دا لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودﷺەوە هاتوە، گوتی: پێغەمبەری ڕاستی ڕاستگۆ پێی فەرموین: "ان احدكم يجمع خلقه في بطن امه اربعين يوماً. ثم يكون في ذلك علقة مثل ذلك. ثم يكون في ذلك مضغة مثل ذلك. ثم يرسل الملك فينفخ فيه الروح. ويؤمر باربع كلمات تكتب: رزقه. واجله. وعمله. وشقي او سعيد: هەریەك لەئێوە بەچل ڕۆژان لەسکی دایکییدا ئافەریدەی کۆدەبتەوە، لەپاش هەنگی بۆ هێندەی دیکە دەبێتە زەرو، ئەوجا بۆ چل ڕۆژی دی دەبتە پارچە گۆشتێك ، پاشان خوا فریشتەیەك دەنێری ڕۆحی بەبەردا دەکا و، بەچوار وشان فەرمانی پێ دەکاو دەنوسرێ: بەبژیو وڕۆزی، بەوادەی مردنی، بەکردەوەی، بەوەی کەنائاسودە دەبێ یائاسودە".

دیسان لەهەردو صەحیحاندا لەئەنەسی مالیكﷺ ەوە هاتوە لەپێغەمبەرﷺ فەرموی: "وكل الله تعالى بالرحم ملكاً. فيقول: أي رب نطفة. أي رب علقة. أي رب مضغة. فاذات أراد ان يقضي خلقها قال: أي رب ذكر ام انثى؟

أشقي أم سعيد؟فما الرزق؟ فما الاجل؟ فيكتب كذلك في بطـــن امـــه: خـوداى بـەرز فریشتـەیەکی بە پـزدان ئەسـپاردوە، دەڵـێ: ئـەی پـەروەردگارم تـۆوە، ئـەی پەروەردگارم زەروە، ئەی پەروەردگارم پارچە گۆشتە، جاکە دەیەوێ ئەفرانی تـەواوکا دەڵـێ: ئـەی پـەروەردگار نێرینـە یـا مێینـە؟نائاسـودە بـێ یـان ئاسودە؟جا ڕۆزی چیـە؟جا ئەجەلی کەیە؟ئەوجا بەمجۆرە لەسـکی دایکیـدا دەنوسرێ".

## پاراستنی ئادەمیزاد لەلایەن فریشتانەوە:

خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ سَوَاءٌ مِنْكُمْ مَنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَنْ جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ، لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ . . : هیچ جیاوازی نیە کەسانێك بەسرتەو بەنهێنی یابە ئاشکرا قسەبکەن خـودا ئاگـای لێیـە، ئـەوی لـەتاریکی شـەودا خـۆی لـەچاوان وەشـێرێ یـا لەڕوناکی رۆژدا بێ خودا لێی بەئاگایە، هەرکەس فریشتە گەلێکی هەن پەیتا پـەیتا لەبـەرو لەپشـت سـەریەوە لـە ڕوداوی ناحـەتمی بەفەرمانـی خـوا دەیپارێزن ﴾ سورة الرعد/١٠-١١.

هـەروەها پاچڤانی قورئـان، ئیبنیعـەبباس، ئـەوەی ڕون کردۆتـەوە کـە (المعقبات) کۆمەڵێك فریشتەن، خوای گەورە دایناون تا لەپێش و لەپشـتەوە پارێزگـاری مـرۆڤ بکـەن. هـەرکاتێکی قـەدەری دیـاریکراوی خـوداش هـات کەدەبو لەو کاتە بیگاتێ، فریشتەکان وازی لێ دێنن.

موجاهید دەڵێ: (هەمو بەندەیەك فریشتەیەکی پێ ڕاسپێردراوە لەکاتی نوستن و کاتی وەئاگایی لەجنۆکە ومرۆڤ و درِندان پاسیدەکاو دەیپارێزێ، جا هەر شتێکی بەرەو ڕوبێ فریشتەکە پێی دەڵێ بگەرێوە. تەنها ئەو شتانە نەبێت کەمۆلەتی خوایان لەسەرەو دوچاریان دەبێ ) .

پیاوێکیش بە عەلی ئەبوطالیبی گوت: کەسانێکی (موراد) دەیانەوێ بتکوژن، عەلی گوتی: هەر پیاوێك دو فریشتەی لەگەڵە، لەو شتانە دەیپارێزن کەبۆی تەقدیر نەکراوە. ئەگەر قەدەریش هات، فریشتەکان لێی دەگەڕێن و جێی دێلن، بەڕاستی مەرگ سوپەرێکی سەختە)، (بگەڕێوە بۆ البداية ١/٥٤)

بەدوای یەك وپەیتا پەیتا هاتوەکان کەلەسورەتی (الرعد) باسیان هاتبو.

هەمان ئەوانەن کەخودا لەم ئایەتەشدا باسیان دەکا: ﴿ وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لاَ يُفَرِّطُونَ: هەر خودا زاڵە بەسەر بەندەکانیداو، چاوەدێرو پارێزەرانتان لەسەر دادەنێ، تا ئەو کاتی مەرگی یەکێك لەئێوە دەگا، ناردراوانی ئێمە گیانی دەستێنن. ئەوانە لەنوسینی کردەوەی بەندەکاندا کۆتایی ناکەن ﴾ سورة الانعام/٦١

جا ئەو چاودێرو پارێزەرانەی خودا دەیان نێرێ. بەندە دەپارێزن هەتا کات و ئاکامی دیاریکراوی دێ.

## فریشتەکان سروشی خوا بە پێغەمبەرەکانی دەگەیەنن:

خوای گەورە ئەوەی پێ ڕاگەیاندوین کە جیبریل تا ڕادەیەکی زۆر تایبەتمەندە بەو ئەرکە مەزنە: ﴿ قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ: بلێ، هەرکەسێکی دوژمنی جیبریل بێ، بابزانێ دوژمنی خوایە، چونکە ئەو بەفەرمانی خوا قورئانی نازڵ کردوە بۆ ناودڵو دەرونی تۆ، قورئانێك کە کتێبە پیرۆزەکانی بەردەستتان بەڕاست دادەنێ و مزگێنیە بۆ باوەڕداران ﴾ سورة البقرة/٩٧.

**هەروەها فەرمویەتی:** ﴿ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ، عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ: **روحولئەمین کەجیبریلە دایبەزاندۆتە سەر دڵ ودەرونی پاکی تۆ تالە ترسێنەران بی** ﴾. سورة الشعراء/١٩٣-١٩٤. .

**ڕەنگە جارانێکی کەم هەبن، فریشتەی دیکە سروش بێنن، هەروەك لەو فەرمودەیە هاتوە، کەموسلیم لەصەحیحەکەیدا لە ئیبنیعەبباس دەیگێڕتەوەو دەڵێ: (جارێك کە جیبریل لەلای پێغەمبەر ﷺ ڕۆنیشتبو، دەنگێکی لەسەرەوە گوێ لێ بو، جاسەری هەڵبڕی و گوتی: ئەوە دەرگەیەکە لەئاسماندا ئەمڕۆ کرایەوە، لەمڕۆ بترازێ چ جاری دی نەکراوەتەوە. جا فریشتەیەکی لێ دابەزی. ئەوجا گوتی: ئەمە فریشتەیەکە دابەزی یە سەر زەوی، لەمڕۆش بترازێ چ جاری دی دانەبەزیوە. جافریشتەکە سڵاوی کرد و گوتی: مزگێنیت بدەمێ تۆ دو نورت بۆ هاتوە، پێش تۆ بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەهاتون ئەوانیش سورەتی (فاتیحة)و دوایین ئایەتەکانی سورەتی (البقرة)ن، هەر پیتێکیان لێ بخوێنیەوە پێت دەدرێ.**

**لە مێژوەکەی ئیبنیعەساکیردا بەسەنەدێکی صەحیح لە حوذەیفەوە هاتوە، کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی:** "اتاني ملك فسلم علي-نزل من السماء لم قبلها- فبشرني ان الحسن والحسين سيدا شباب اهل الجنة. وأن فاطمة سيدة نساء اهل الجنة: **فریشتەیەك هاتە لام یەکەم جاری بو لەئاسمانێ دابەزیو، پێشتر چ جاران دانەبەزیبو، موژدەی ئەوەی دامێ کەحەسەن و حوسێن سەروەری لاوەکانی بەهەشتیانن و، فاطیمەش خانمی ژنانی بەهەشتێیە** " (صحيح الجامع ٨٠/١).

**هەروەها لەموسنەدی ئەحمەد و تەرموذی و نەسائیدا لەحوذەیفەوە هاتوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی:** "أما رايت العارض الذي عرض لي قبيل؟هو ملك من الملائكة لم يهبط الى الارض قط قبل هذه الليلة. استأذن ربه-عزوجل-أن يسلم علي. ويبشرني ان الحسن والحسين سيدا شباب اهل الجنة. وان فاطمة سيدة نساء اهل

**الجنة: ئەدی نەت دیت پێش کەمێك چۆنم بەسەرهات؟ ئەمە فریشتەیەك بو لە فریشتان. هەرگیز لەپێش ئەم شەوەدا چ جاریٚ دی دانەبەزیوەتە سەرزەوی، مۆڵەتی لەپەروەردگاری خۆی خواست، تابیٚ و سلاوم لیٚ بکاو موژدەی ئەوەم پیٚ بدا کەحەسەن و حوسەین سەروەری گەنجانی ئەهلی بەهەشتن و، فاطیمەش خانم و سەروەری ژنانی بەهەشتیینە "** (صحيح الجامع ١/٤١٩).

**دیسان لەموسنەدو لەسونەنی تەرموذی بەسەنەدێکی صەحیح لە ثوبەی کوڕی کەعبەوە هاتوە، کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی:** "أتاني جبريل وميكائيل. فقعد جبريل عن يميني. وميكائيل عن يساري. فقال جبريل: يامحمد: اقرا القرآن على حرف. فقال ميكائيل استزده. فقلت زدني. فقال: اقرأه على ثلاثة احرف. فقال ميكائيل استزده. فقلت: زدني. كذلك حتى بلغ سبعة احرف. فقال: اقرأه على سبعة احرف. كلها شاف كاف: **جیبریل ومیکائیل هاتنە لام، جیبریل لەلای ڕاستم دانیشت و، میکائیل لەلای چەپم، جیبریل گوتی: ئەی موحەممەد، قورئانم بۆ لەسەر پیتێك بخوێنەوە، میکائیل گوتی: داوای زێتری لیٚ بکە، گوتم: بۆم زیادکە گوتی: لەسەر سیٚ پیتان بیخوێنە، میکائیل گوتی: داوای زێتری لیٚ بکە، گوتم بۆم زێدەبکە، جائەمە دوبارە بۆوە تاگەیشتە هەفت پیتان، ئەوجا گوتی: لەسەر هەفت پیتان بخوێنەوە، هەموی ڕاست و دروستە"**[1]، (صحيح الجامع ١/٨٠).

---

[1] **ئەوەی باسمان کرد کەفریشتەکان باڵیۆزی خودان بۆ ئافەریدانیو، هەڵگرانی سروشی خوان بۆ پێغەمبەرەکانی، مانا زمانەوانیەکەی وشەی (ملك) مان بۆ ڕون دەبتەوە (الملك) لەبنچینەدا لە (ألك) هاتوە و؛ (المالكة) و (المألكة) و، (المألك) واتای پەیام (رسالة) دەگەیەنیٚ؛ (الملائك) یش لەمەوە وەرگیراوە. چونکە فریشتە پەیامبەری خودان، دەشلێن لە (ألك) هەلێنجراوەو، (الملأكة) واتا پەیام، (ألكني الى فلان) واتە لەمنەوە بەفلان بگەیەنە. (الملأك) یش واتا فریشتە (الملك) چونکە لەخواوە دەهێنن و دەگەیەنن. هەندیٚ تۆژەریش دەلێن (الملَك) لە (الملِك) هاتوە، جا ئەوەی لەفریشتەکان بڕێك سیاسەتی ئەسپاردە دەکریٚ پیٚ ی دەگوتریٚ: (ملَك)، لەناو مرۆڤانیش پیٚ ی دەلێن (ملِك). (بگەڕێوە بۆ** بصائر ذوي التمييز ٤/٥٢٤).

## هەر کەسێکی فریشتەی بێتە لا پێغەمبەر نیە:

هەرکەسێکی فریشتەی هاتەلا بەپێغەمبەر دانانرێ و، ئەو گومانەش خەیاڵە، چونکە خوا جیبریلی ناردۆتە لای مەریەم، هەروەك بۆلای دایکی ئیسماعیلی هەنارد، کاتێك ئاو و خۆراکی لەلا نەما.

یاوەرانیش جیبریلیان بەوێنەی عارەبێکی سارانشین دیت. هەروەها خوای گەورە فریشتەیەکی ناردە لای ئەو پیاوی لەبەر خوا سەردانی برایەکەی خۆی دەکرد. تاموژدەی بداتێ کەخوا خۆشی دەوێ چونکە ئەو براکەی خۆش دەوێ ئەم نمونانەش زۆرن، مەبەستیش هەر ئاگادار کردنەوەیە.

## چۆن سروش بۆ پێغەمبەر ﷺ دەهات:

حاریثی کوڕی هیشام ﵁ لەپێغەمبەرﷺ ی پرسی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن سروشت بۆ دێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "احیانا یأتیني مثل صلصلة الجرس وهو اشده علي. فیفصم عني وقد وعیت عنه ماقال. واحیانا یتمثل الملك رجلاً فیکلمني فأعي ما یقول: جار هەیە وەکو دەنگی زەنگ بۆم دێ، ئەمەش سەخت ترینیانە، کەلێم جودا دەبێتەوە، چی پێ گوتم دێتە هۆشم، هەندێ جاریش فریشتەکە دێتە سەر شێوەی پیاوێك لەگەڵم دەدوێ و، هۆشمەند دەبم بەوەی دەیڵێ"[٢].

هەندێك جار جیبریل دەهاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پەیوەندی پێوەدەکرد کەبەخۆی لەباری فریشتایەتی بو. ئەم جۆرەش زۆر توند و سەخت بو بۆ پێغەمبەر ﷺ . باری دوەمیش وابو کە جیبریل لەباری فریشتاتی دەچوە سەر شێوەی مرۆڤ. جا ئەوەیان ساناتر بو بۆ پێغەمبەر ﷺ . پێغەمبەریش دو جاران جیبریلی لەوێنەی تایبەتی خۆی دیت کەخوای گەورە پێ ئافریدەی کردوە. جارێکیان سێ ساڵ پاش پێغەمبەرایەتی بو. هەروەکو

لەصحیحی بوخاریدا هاتوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی: "بینما انا امشي. اذ سمعت صوتاً من السماء. فرفعت بصري فاذا الملك الذي جاءني بحراء جالس على كرسي بين السماء والارض. فرعبت منه. فرجعت. فقلت: زملوني: جارێك بەرێدا دەرۆیشتم، لەئاسمانیڕا گوێم لەدەنگێك بو. چاوم بلّند کرد. دیتم ئەو فریشتەی لەئەشکەوتی حەرا هاتە لام وا لەسەر کورسیەك دانیشتوە لەنێوان ئاسمان و زەویدا، زۆری لێ ترسام، ئەوجا گەڕامەوەو گوتم: دامپۆشن".

جاری دوەمیش ئەو جاری بو کەپێغەمبەر ﷺ بۆئاسمانێ بەرز کراوە، هەردو جاریش لەسورەتی (النجم) دا باسیان کراوە: ﴿ عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى، ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى، وَهُوَ بِالأُفُقِ الأَعْلَى، ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى، فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى، فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى، مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى، أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى، وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى، عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى، إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى، مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى: فریشتەیەکی زۆر بەهێز دەرسی داوە، خاوەن هێزو دەسەلات و شکۆیە ، لەئاسۆی بلّندی ئاسمان بو، لەپاشان نێزیك کەوتەوە لە پێغەمبەر ﷺ و هاتەخوارەوە، بەقەد دو کەوان یان کەمتر، ئینجا خودا سروشی بۆ کرد، ئەوەی کەبۆی کرد، ئەوەی کە موحەممەد بینی، بەدرۆی نەزانی، ئایا بێ بڕوایان نکوڵی لەوە دەکەن کەپێغەمبەر ﷺ بەچاوی خۆی دەیبینێ؟! بێگومان جارێکی دیکە جیبریلی دیت، بەوێنەی خۆی لەشەوی بەرزبونەوەدا، لەلای (سیدرەتولمونتەها)وە، کە لەلای ئەوەوەیە بەهەشتی ئارامگا، کاتێك (سیدرە)ی داپۆشی، ئەوەی داپپۆشی، چاوی پێغەمبەر ﷺ ئەو لاو ئەو لای نەکرد، وەلەمەبەست تێنەپەڕی ﴾ . سورة النجم /٥-١٧.

## ئەركی جیبریل تەنها سروش گەیاندن نیە :

ئەرك و كارەكانی جیبریل تەنها لەگەیاندن و هێنانی سروش لەلای خوای بەرزەوە گردنەبۆتەوە. چونكە هەمو ساڵێك لەڕەمەزانێ شەوانە دەهاتە لای پێغەمبەرﷺ وقورئانی پێ دەخوێندەوە. ئەمەش فەرمودەیەكی صەحیحە، بوخاری لەصەحیحەكەیدا هاوردویەتی.

## پێشنوێژی جیبریل بو پێغەمبەر:

جیبریل پێش نوێژی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەكرد، تاكو خوای بەرز چۆنی دەوێ، ئاوا فێری نوێژی بكا:

لەصەحیحی بوخاریدا هەیە، كەپێغەمبەر ﷺ فەرموی: "نزل جبريل فأمني فصليت معه. ثم صليت معه. ثم صليت معه. ثم صليت معه. يحسب بأصابعه خمس مرات: جیبریل دابەزی جا پێشنوێژی بۆكردم و نوێژم لەگەلی كرد، پاشان نوێژم لەگەڵ دا كرد، پاشان نوێژم لەگەڵی كرد، پاشان نوێژم لەگەڵی كرد، پاشان نوێژم لەگەلی كرد، بەپەنجەكانی پێنج جاران ژماردی".

هەروەها لە موسنەدی ئەحمەدو سونەنی نەسائی و ئەبو داود، لەئیبنیعەبباسەوە هاتوە، كەپێغەمبەر ﷺ فەرموی: "امني جبريل عند البيت مرتين. فصلى بي حين زالت الشمس. وكانت قدر الشراك. وصلى بي العصر حين كان ظل الشيء مثله. وصلى بي المغرب حين افطر الصائم. وصلى بي العشاء حين غاب الشفق. وصلى بي الفجر حين حرم الطعام والشراب على الصائم. فلما كان الغد. صلى بي الظهر حين كان ظل الشيئ مثله. وصلى بي العصر حين كان ظل الشيء مثليه. وصلى بي المغرب حين افطر الصائم. وصلى بي العشاء الى ثلث الليل. وصلى بي الفجر فاسفر. ثم التفت الي وقال: يامحمد هذا وقت الانبياء من قبلك. والوقت ما بين هذين الوقتين: جیبریل دو جاران لەلای بەیتەوە پێش نوێژی بۆ كردم، جا كاتێك ڕۆژ

لەجەرگەی ئاسمانیٚ وەلاکەوت و بەقەدەر قـەیتانێك بـو نوێـژی پـیٚ کـردم، پاشـان نوێژی عەسری پـیٚ کـردم کەسـێبەری هەرشـتێك دو هێنـدەی خـۆی لێهات، کاتی بەڕۆژو ڕۆژیەکەیان شکاند نوێـژی مـەغریبی پـیٚ کـردم، پاشـان نوێژی عیشـای پـیٚ کـردم کـە بولێـل ئـاوابو، نوێـژی سپێدەشـی پـیٚ کـردم لەوکاتـەی خـواردن وخواردنـەوە لـەڕۆژوەوان حـەرام دەبـیٚ، کـە گەیشـتینە سبەینیٚ، نوێژی نیوەڕۆی پیٚ کردم کاتێك سێبەری هەرشتێك بەقەدەر خۆی لیٚ هات و، نوێژی عەسری پیٚ کردم کە سێبەری هەرشتێك دو هێندەی خۆی لیٚ هـات، وەنوێـژی مـەغریبی پـیٚ کـردم کـەڕۆژوگر ڕۆژیـان شـکاند، نوێـژی عیشاشی لەسێیەکی شەودا پیٚ کردم، نوێژی سپێدەشی پیٚ کردم کە دونیا ڕونـاك بۆوە، پاشـان ئـاوڕی لیٚ دامـاوەو گوتـی: ئـەی موحەممـەد ئەمـە کـاتی پێغەمبەرەکانی پێش تۆن، کاتەکەش لە نێوانی ئەو دو کاتەدایە".

جـا جیـبریل بەتـەنیٚ کـرداری نوێـژ و کاتـەکانی نوێـژ کردنـی فـێری پێغەمبـەرﷺ نـەکرد، بـەڵکو چۆنیـەتی دەسـتنوێژ شوشتنیشـی فـێرکرد، لەموسنەدی ئەحمەد و موستەدرەکی حاکیم، لەزەیدی حاریثە وە هـاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "أتاني جبريل في اول ماأوحي الي. فعلمني الوضوء والصـلاة. فلما فرغ من الوضوء. أخذ غرفة من الماء فنصخ بهـا فرجـه: لەسـەرەتای سروش بۆهـاتنم، جیبریل هاتـە لام و، دەستنوێژو نوێـژی فـێرکردم، کەلەدەسـتنوێژ شوشتن بۆوە، گۆلمە ئاوێکی هەڵگرت و لەدامەنی خۆی پژاند".

## نوشتەو نزای جیبریل بۆ پێغەمبەر ﷺ:

هـەروا موسـلیم لەصەحیحەکـەیدا وتـەرموذی لەسـونەنەکەی و هـی دیکەش لەئەبوسەعیدەوە دەگێڕنـەوە، دەڵـیٚ: پێغەمبـەر ﷺ فـەرموی: "أتـاني جبريل فقال: يامحمد اشتكيت؟ قلت: نعم. قال: بسم الله أرقيك. من كل شيء يؤذيك.

من شر كل ذي نفس وعين حاسد. بسم الله ارقيك. والله يشفيك: **جيبريل هاته لام گوتى: ئەى موحەممەد نەخۆشى ؟گوتم: بەڵێ، گوتى: بەناوى خوا بۆت دەپارێمەوە خوا بتپارێزى لەهەمو شتێکى کەئازارت دەدا، لەخراپەى هەمو خاوەن نەفەس و لەچاوى حەسودان، بەناوى خودا نزات بۆ دەکەم، خوداش چارەت دەکا".**

## کردەوەی دیکەی جیبریل:

**لەکردەوەکانى دیکەى، جەنگانى بو لەپاڵ پێغەمبەر ﷺ لەبەدرو لەخەندەق دا، هەروەها هاوەڵێتى کردنى پێغەمبەر ﷺ لەشەوڕۆیى و کردەوەى دیکەش.**

## بزواندنى ئەنگێزەکانى چاکەکارى لەدەرونى بەندەکاندا:

**خواى گەورە هاوەدەمێکى لەفریشتان و، هاوەدەمێکى لەجنۆکان، بۆ هەر مرۆڤێك داناوە، لەصەحیحى موسلیمدا لە ئیبنیمەسعودەوە هاتوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموى:** "ما منكم من احد الا وقد وكل به قرينه من الجن وقرينه من الملائكة: **هەر یەکێك لەئێوە هاوەدەمێکى لەجنۆکان و هاوەدەمێکى لەفریشتان ئەسپاردەکراوە". گوتیان: لەگەڵ تۆش ئەى پێغەمبەرﷺ ى خوا؟ فەرموى:** "واياي. ولكن الله اعانني عليه فأسلم فلا يأمرني الا بخير: **لەگەڵمنیش، بەلام خودا هاریکارى لەگەڵ کردم، لەسەرى و موسڵمان بو، بەچاکەو خێر نەبێ فەرمانم پێ نەکا". وەڕەنگە ئەو هاوەدەمەش جوایەزبێ لەو فریشتانەى فەرمانیان پێ کراوە کردەوەکانى مرۆڤ تۆماربکەن، خودا ئەمەى بۆ هەندێ تەرخان کردوە، ڕێنمونى و ڕابەرێتى مرۆڤ بکات.**

**هاوەدەمە فریشتەکەو هاوەدەمە جنۆکەکە، مرۆڤ لەنێوان خۆیان دەینن و دەبەن. ئەویان فەرمانى خراپەى پێ دەکاو بەرەو خراپکارى دەباو، ئەویان**

**هانی دەدا چاکە بکاو بۆ لای باشە ڕێبەری دەکا، لەئیبنیمەسعودەوە ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** "ان للشيطان لمة بابن آدم، وللملك لمة؛ فأما لمة الشـــيطان؛ فأيعاد بالشر، وتكذيب بالحق. واما لمة الملك فايعاد بالخير وتصديق بالحق. فمن وجد من ذلك شيئاً فليعلم انه من الله، وليحمد الله. ومن وجد الاخرى فليتعوذ بالله من الشيطان الرجيم، ثم قـــرأ: ﴿ الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ وَاللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ ســورة البقـــرة/٢٦٨.: **شەیتان و فریشتە، هەریەکە نزیکبونەوەیەکیان لەگەڵ ئادەمیزاد هەیەو، هەرچی نزیکبونەوەکەی شەیتانە، بەڵێندانە بەشەڕو خراپەکاری و بەدرۆخستنەوەی حەقە، هەرچی نزیکبونەوەی فریشتەکەشە، بەڵێندانە بەخێرو چاکەکاری و بەڕاستزانینی حەقە، هەرکەسێکی هەستی بەمەیان کرد، بابزانێ لەخواوەیەو، باسوپاسی خودا بکا،ئەو کەسەی هەستی بەوەی تریش کرد، باخۆی بەخوای گەورە پەنابگرێ لەشەیتانی ڕەجیم ئەوجا ئایەتی ٢٦٨ ی سورەتی (البقرة)ی خوێندەوە کەدەفەرمێ** ﴿ الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ وَاللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ: **شەیتان ترسی تەنگ دەستیتان وەبەر دەنێ و فەرمانتان پێ دەدا کاری ناشیاو بکەن، بەڵام خودا بەڵێنی لێخۆشبون و زۆر بونی ماڵتان پێ دەداو خودا زاتێکی خاوەن نیعمەتی پەرەدارو زاناو ئاگایە** ﴾" (قال ابن كثير بعد سوقه لهذا الحديث: (هكذا رواه الـــترمذي والنســـائي في كتابي التفسير من سننهما جميعاً. عن هناد بن السري واخرجه ابن حبان في صحيحه. عـــن ابي يعلي الموصلي. عن هناد به. وقال الترمذي حسن غريب وهو حديث أبي الاحــــوص. يعني سلام بن سليم ...).

**سەیری ئەم فەرمودەیەش بکە تا بزانی چۆن هاوەدەمە جنۆکەکەو هاوەدەمە فریشتەکە کێ بەرکێیانە بۆ ئاراستەکردنی مرۆڤ، ئەبو موسای**

**حافیز لەفەرمودەی زوبەیر لەجابیرەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** "اذا اوى الانسان الى فراشه. ابتدره ملك وشيطان. فيقول الملك: اختـــم بخـــير. ويقـــول الشيطان: اختم بشر. فاذا ذكر الله تعالى حتى يغلبه -يعني النوم-طرد الملك الشـــيطان وبات يكلؤه. فاذا استيقظ. ابتدره ملك وشيطان. فيقول الملك: افتح بخـــير. ويقـــول الشيطان: افتح بشر. فان قال الحمد لله الذي احيا نفسي بعد ما اماتهـــا. ولم يمتـــها في منامها. الحمد لله الذي يمسك التي قضى عليها الموت. ويرسل الاخرى الى أجل مسمى. الحمد لله الذي يمسك السموات والارض ان تزولا. ولئن زالتا ان امسكها احـــد مـــن بعده. الحمد لله يمسك السماء ان تقع على الارض الا بأذنه. طرد الملك الشيطان وظـــل يكلـــؤه: **ئەگەر مرۆڤ چوە سەر نوێنی خۆی، فریشتەیەك و شەیتانێك تالوكەی لێ دەكەن، جافریشتەكە پێی دەڵێ: بەچاكەو خێر كۆتا بەڕۆژەكەت بێنە، شەیتانەكەش پێی دەڵێ: بەخراپەو شەڕ كۆتایی پێ بێنە. جا ئەگەر یادی خودای بەرزی كرد تا چاوی دەچێتە خەوێ ئەوا فریشتەكە شەیتانەكە دەردەكاو تاسبەینێ كۆتی دەكا، جا ئەگەر لەخەوێش هەستا فریشتەیەك و شەیتانێك تالوكەی لێ دەكەن، جا فریشتەكە پێی دەڵێ: بەخێر ڕۆژت بكەوەو، شەیتانەكەش دەڵێ: بەشەڕ دەستی پێ بكە، جا ئەگەر گوتی سوپاس بۆ ئەو خودایەی كەپاش مردن زیندوی كردمەوەو لەخەویدا یەكجاری نەیمراندم، سوپاس بۆ ئەو خودایەی ئەو گیانە دەكێشی كە كاتی مردنی هاتوەو ئەوی دیكەش وازلێدێنی تاكاتی دیاری كراوی خۆی. سوپاس بۆ ئەو خودایەی نایەڵێ ئاسمانەكان و زەوی وەلاچن، ئەگەر لاشبچن جگە لەو كەسێك ناتوانێ ڕایانگری، سوپاس بۆ ئەو خودایەی ئاسمانی گرتوە تا نەكەوێتە سەر زەوی بەئیزنی خۆی نەبی، ئەگەر وای گوت: فریشتەكە شەیتانەكە وەدەردەنێ و كۆتی دەكا**" قال محقق كتاب الوابل الصيب معلقاً على هذا الحديث: (ورواه بمعناه ابن حبان رقم٢٣٦٢ (موارد)، والحاكم ١/٥٤٨ وصححه ووافقـــه

الذهبي ورجاله ثقاة، وذكره الهيثمي في مجمع الزوائد (١٠/١٢٠) وقال: رواه ابو يعلى، ورجاله رجال الصحيح، غير ابراهيم الشامي وهو ثقة، نقول وصوابه: ابراهيم بن حجاج السامي بالسين المهملة).

**جا ئەم فەرمودانە ئاراستەمان دەکەن بۆ زێدەکردنی کردەوەی چاك، کەدەرونمان چادەکاو فریشتەکانمان لێ نزیك دەکاتەوە. چونکە نێزیکی فریشتان لێمان خێرێکی مەزنی پێوەیە؛ لەبەرئەوەی:** "كان رسول الله ﷺ اجود الناس، وكان اجود مايكون في رمضان حين يلقاه جبريل، وكان يلقاه في كل ليلة من رمضان فيدارسه القرآن، فلرسول الله ﷺ اجود بالخير من الريح المرسلة: **پێغەمبەر ﷺ لەهەمو خەڵکی بەخشندەو جوامێرتر بو. رەمەزانیش کە جیبریل دەهاتە لای پێغەمبەر لەهەمو کاتێك بەخشندەتر بو، هەمو شەوانی رەمەزان جیبریل دەهاتە لای و قورئانی پێ دەخوێند، بەڕاستی پێغەمبەری خودا ﷺ لەنزەبای هەڵکردو بەخشندەو جوامێرو ناندەرتر بو** " (رواه البخاري عن ابن عباس).

## تۆمارکردنی کردەوەی ئادەمیان:

**فریشتەکان تۆمارکردن و پاراستنی کردەوەی باش و خراپی ئادەمیزادیان ئەسپاردە کراوە. خوای بەرزیش مەبەستی ئەوان فریشتانە کە دەفەرموێ:** ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ، كِرَامًا كَاتِبِينَ، يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ: **بەڕاستی پارێزەرانێك لەسەر ئێوەن، نوسەرانی هێژاو بەڕێز، دەزانن ئێوە چی دەکەن** ﴾ سورة الانفطار/١٠-١٢. **جا خوای گەورە بۆ هەرمرۆڤێك دو فریشتەی ڕاسپاردوە کەهەمیشە لە لای ئامادەن و لێی جودا نابنەوە. کردەو گۆتەکانی هەژمارد دەکەن:** ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ، إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ، مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا

لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ: ئێمه مرۆڤمان وەدی هێناو بەوەسوەسەی دەرونی دەزانین و لەڕەگی گەردنی لێی نزیك ترین، كاتێك دو فریشته لەلای ڕاست و لای چەپی مرۆڤ دانیشتون و كردەوەی دەنوسن، مرۆڤ هەر قسەیەك بكا فریشتەیەك چاوەدێری دەكات ﴾ سورة ق/١٦-١٨.

ئەوەی ئاشكرایه، ئەو فریشتانەی بەمرۆڤ ڕاسپێری كراون، هەمو كردارو گوفتارێكی لەو مرۆڤەوە بێ دەینوسن و، هیچی جێ ناهێڵن، چونكه خوای بەرز دەفەرمێ: (مایلفظ من قول) .

بۆیه مرۆڤ دەبینی كردەنامەكەی هەمو شتێكی وی گرتۆته خۆ. هەر لەبەر هەندێش بێ بڕوایان كاتێ كردەنامەكەیان دەبینن لەرۆژی بەرێدا هاواردەكەن و دەڵێن: ﴿..یَاوَیْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لاَیُغَادِرُ صَغِیرَةً وَلاَكَبِیرَةً إِلاَّ أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلاَیَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا: واوەیلا بۆ ئێمه، ئەمه چ كتێبێكه كه هەمو كردەوەیەكی گەورەو گچكەی بەهەژمار لەنێو خۆدا جێ كردۆتەوەو، هەمو ئاكامی كردەكانیان بەئامادەیی دەبینن و، پەروەردگارت ستەم لەكەس ناكا ﴾ سورة الكهف/٤٩.

لەموسنەدی ئیمام ئەحمەدیشدا لەبیلالی كوڕی حاریثي موزنی ﷺ، هاتوه، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "ان الرجل ليتكلم بالكلمة من رضـــوان الله تعالى ما يظن ان تبلغ ما بلغت يكتب اليه ﷻ له بها رضوانه الى يوم يلقاه، وان الرجـــل ليتكلم بالكلمة من سخط الله تعالى ما يظن ان تبلغ ما بلغت، يكتب الله تعالى عليه بهـــا سخطه الى يوم يلقاه: پیاو هەیه وشەیەك دەئاخێوێ كەخودای بەرز پێی ڕازیه، وا بەتەما نیه بگاته ئەو پلەیه، خوای گەوره ڕەزامەندی خۆی پێ دەنوسی تا ئەو رۆژەی دەگاته لای خوا. پیاویش هەیه وشەیەك دەڵێ لەتوڕەیی خودای

بەرز، گومان نابا بگاتە ئەو پلەیە لەخراپی، خودا تورەبونی خۆی لەو پیاوە پێ دەنوسێ تا ئەو رۆژەی بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە.جا عەلقەمە دەیگوت: ئەم فەرمودەیەی بیلالی کوری حاریث ریێی زۆر قسەو ئاخاوتنانی لێ گرتوم.."
(ورواه الترمذي والنسائي وابن الماجة وقال الترمذي حسن صحيح

ئیبنی کەثیر لەتەفسیرەکەیدا لەحەسەنی بەصریەوە دەگێڕتەوە کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿..عَنْ الْيَمِينِ وَعَنْ الشِّمَالِ قَعِيدٌ: لەلای ڕاست و لای چەپی مرۆڤ دانیشتون﴾ سورة ق/١٧.

پاشان گوتی: هۆ ئادەمیزاد، پەڕاوت بۆ ڕاخراوە و، دو فریشتەی خاوەن پایەو رێزت پێ ئەسپێردراوە، یەکێکیان لەڕاستەتەو، ئەوی دیکە لەچۆپەت. هەرچی ئەوەی لای ڕاستەیە جوانکاریت دەپارێزێ و، هەرچی ئەوەی لای چەپیشە بەدکاریت دەپارێزێ، جا چی دەتەوێ بیکە، کەمی بکە یا زۆر، تا کاتێ دەمری پەڕاوەکەت دادەخرێ و لەملت دەکرێ، لەگەڵتدا لەناو گۆڕەکەت هەتا لەڕۆژی دواییدا دێیەدەرێ، لەو کاتیدا خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا، اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا: کردەوەی هەر مرۆڤێکمان کردۆتە ملی و چاکەو خراپەی خۆی بەئەستۆیەتی و، لەڕۆژی دوایی کتێبێکی بۆ دەردێنین کەبەئاوەڵایی دەیبینێ، پێی دەڵێن: کتێبەکەت بخوێنەوە، بۆ تۆ بەسە کە ئەمڕۆ خۆت هەژمار لەخۆت بکێشی﴾ سورة الاسراء/١٣-١٤.

ئەوجا حەسەن دەڵێ: سوێند بەخوا زۆر دادگەر بوە ئەوی خۆتی کردۆتە حەسیبی خۆت.

هەروەها ئیبنی کەثیر لەبارەی ئایەتی: ﴿ مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ: مرۆڤ هەر قسەیەك بكات فریشتەیەك ئاگای لێیەو چاودێری دەكات ﴾ سورة ق/١٨.

باس دەكا كە ئیبنیعەبباس دەڵێ: هەرچی بیڵێ دەینوسی جاچ خێربێ چ شەڕ، تەنانەت ئەوە دەنوسی كە بڵێ: خواردم، خواردمەوە، چوم، هاتم، دیتم. تا ڕۆژی پێنج شەمان دێ و كردەوگۆتەكانی نیشان دەداو بڕیاری ئەوە دەدا چ چاكەیەكی تێدایەو چ خراپەیەكی تێدا، ئەوی تریش فڕێ دەدا، ئەمەش بەپێی ئەم ئایەتەی دەفەرمێ: ﴿ يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ: هەرچی خوا بیەوێ لەناوی دەباو دەیسڕێتەوە، هەرچیشی بوێ دەیهێلیتەوەو، كتێبی بنچینەش لای ئەوە ﴾ سورة الرعد/٣٩.

هەروەها ئیبنیكەثیر لەباسی ئیمام ئەحمەدا دەڵێ; نەخۆش بو دەینالاند. بەرگێی كەوت طاوس گوتویەتی: فریشتە هەمو شتێك دەنوسێ تەنانەت ناڵە ناڵیش، لەپاش هەنگی ئیمام ئەحمەد تا مرد نەینالاند، رەحمەتی خوای لێ بێ.

## فریشتەی لای ڕاست جوانكاریەكان دەنوسی و ئەوی دی بەدكاریەكان:

طەبەرانی لە (المعجم الكبیر) دا بە ئیسنادێكی چاك لەئەبو ئومامەوە هێناویە، كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "ان صاحب الشمال لیرفع القلم ست ساعات عن العبد المسلم المخطيء، فان ندم واستغفر الله منها القاها، والا كتبَ واحدة: فریشتەی دەستە چەپ، شەش سەعات قەڵەمەكەی هەڵدەگرێ لەو بەندە موسوڵمانەی هەڵەیەكی كردوە. جا ئەگەر پەشیمان بۆوەو، داوای خۆشبون

ولێبوردنی لەخودا کرد، نایینوسیٚ، ئەگەرنا ئەوە هەر بەیەك گوناه دەینوسیٚ " (صحيح الجامع ٢/٢١٢).

## ئایا فریشتەکان کردەی دڵان دەنوسن؟!

ڕاڤەکاری طەحاوی بۆ بەڵگە لەسەر ئەوەی کە فریشتەکان کردەوەی دڵان دەنوسن ئەم ئایەتەی هاوردوە: ﴿ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ: دەزانن ئێوە چی دەکەن ﴾ سورة الانفطار/١٢. ئەم ئایەتەش گشگیرەو کردەدەرەکی وناوەکیەکان دەگرتەوە.

هەروەها فەرمودەیەکی بەبەڵگە هێناوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: (قال الله عزوجل اذا هم عبد ن بحسنة فلم يعملها فاكتبها له بحسنة، فان عملها فاكتبوها عشرا: ئەگەر بەندەیەکی من ویستی چاکەیەك بکا بەڵام نەیکرد ئێوە چاکەیەکی بۆ بنوسن، بەڵام کەچاکەکەی کرد، دەچاکەی بۆ بنوسن ) (متفق عليه).

لەفەرمودەیەکی تریشدا هاتوە: "قالت الملائكة ذاك عبد يرد ان يعمل سيئة، وهو ابصر به، فقال؛ ارقبوه فان عملها فاكتبوها بمثلها. وان تركها فاكتبها له حسنة. انما تركها من جرائي: فریشتە دەڵێن: ئەوێهیٚ بەندەیەکە دەیەوی خراپەیەك بکا، خوداش چاتری چاو لێیە، دەفەرمیٚ؛ چاوەدێری بکەن، ئەگەر گوناهەکەی کرد، بەقەدەر خۆی بینوسن، ئەگەر وازیشی لیٚ هێنا، چاکەیەکی بۆ بنوسن. چونکە هەر لەبەر من وازی لیٚ هێناوە" (الطحاوي/٤٣٨).

## وێچونێك:

ڕەنگە بڵێین، ئەدی ئەگەر فریشتەکان ویست و مەبەستی مرۆڤ بزانن، پێچەوانە نیە لەگەڵ ئەو ئایەتەی دەفەرمویٚ: ﴿ يَعْلَمُ خَائِنَةَ الأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي

الصُّدُورُ: خیانەتی چاوەکان و ئەوەی وا لە دڵ و دەرونیان شاردراوەتەوە دەیانزانیْ ﴾ سورة غافر/١٩.

لەوەڵامدا دەڵێین: ئەمە لەتایبەتمەندێتیەکانی زانستی خودای بەرز نیە. ئەگەر چی لەمرۆڤیش بزرەو، کەس نازانیْ ویژدانی براکەی چی تێدایە، مانای وانیە فریشتەش لێی بیْ ئاگان و نایزانن.

دەشگوترێ کە فریشتەکان هەندێك لەنهێنی دڵان دەزانن، کەویست و مەبەستە، بەڵام مەسەلەکانی دیکەی وەکو بیروباوەڕ هیچ بەڵگەی لەسەر نیە فریشتە بیزانن.

## بانگهێژی بەندان بۆ چاکەکاری لەلایەن فریشتانەوە:

لەصەحیحی بوخاری لەئەبوهورەیرە‌ﷺ هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "ما من یوم یصبح فیه العباد الا ملکان ینزلان فیقول احدهما اللهم اعط منفقاً خلفا. ویقول الاخر اللهم اعط ممسکا تلفا: هەر ڕۆژێکی بەندەکان سبەینەی لیْ بکەنەوە، دو فریشتە دادەبەزن، جا یەکێکیان دەڵیْ: خودایە پاشماك ببەخشە بەخشەران و، ئەوی دیشی دەڵیْ: خودایە تێداچون ببەخشە ئەوانەی ڕژدن و نابەخشن". ئیبنی حەجەریش لەڕاڤەی ئەو فەرمودەیەدا، ریوایەتێکی دی لەئەبودەردائەوە دێنیْ. کە تێیدا هاتوە "مامن یوم طلعت فیه الشمس الا وبجنبتها ملکان ینادیان یسمعه خلق الله کلهم الا الثقلین یاایها الناس هلموا الی ربکم. ان ما قل وکفی خیر مما کثر والهی. ولا غربت شمسه الا وبجنبیها ملکان ینادیان: هەر ڕۆژێکی خۆری لیْ هەڵبیْ دو فریشتەی لەپاڵن. بانگێك دەکەن هەمو ئافەریدانی خوا دەیبیەن، لەئادەمی و جنۆکان بترازیْ، دەڵێن: هۆ خەڵکینە بەرەو پەروەردگارتان وەرن. ئەگەر کەم بیْ وبەش بکاو بەس بیْ، چاکترە لەوەی زۆربیْ و بخافڵێنیْ. خۆری هیچ ڕۆژێکیش ئاوانابیْ مەگەر دو

فریشتەی لەگەڵ بێ وبانگ بکەن" ئەوجا وەکو فەرمودەکەی ئەبوهورەیرەی پێشوی هێناوەتەوە.

## تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد:

وەدەبێ خوای گەورە هەندێك لەفریشتانی خۆی بنێرێ تا ئادەمییان تاقیکەنەوەو بیانئەزمونن. لەبوخاری و موسلیمدا، لەئەبوهورەیرە ﷺ هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ ی بیستوە، دەیفەرمو: "ان ثلاث من بني اسرائيل: ابرص. واقرع. واعمى. أراد الله ان يبتليهم فبعث اليهم ملكا.

فأتى الابرص فقال: أي شيء احب اليك؟ فقال: لون حسن. وجلد حسن. ويذهب عني الذي قذرني الناس. فمسحه. فذهب عنه قذره. واعطى لون حسنا وجلدا حسنا. قال: فأي المال احب اليك؟ قال: الابل. او قال: البقر. فأعطى ناقة عشواء (أي حامل) . فقال: بارك الله لك فيها.

فأتى الاقرع. فقال: أي شيء احب اليك ؟ قال: شعر حسن. ويذهب عني الذي قذرني الناس. فمسحه فذهب عنه. واعطى شعرا حسنا. قال: فاي المال احب اليك ؟قال: البقر. فأعطى بقرة حاملاً. وقال: بارك الله لك فيها.

فأتى الاعمى. فقال: أي شيء احب اليك ؟ ان يرد الله الي بصري. فابصر النلس. فمسحه فرد الله اليه بصره. قال: فاي المال احب اليك ؟ قال: الغنم. فاعطى شاة والداً فانتج هذا وولّد هذا.

فكان لهذا واد من الابل. ولهذا واد من البقر. ولهذا واد من الغنم.

ثم انه اتى الابرص في صورته وهيئته. فقال: رجل مسكين قد انقطعت بي الحبال في سفري. فلا بلاغ لي اليوم الا بالله ثم بك. اسألك بالذي اعطاك اللون الحسن. والجلد الحسن. والمال. بعيراً اتبلغ به في سفري. فقال: الحقوق كثيرة. فقال: كأني أعرفك. ألم تكن أبرص يقذرك الناس. فقيراً فأعطاك الله ؟ فقال: انما ورثت هذا المال كابراً عن كابر. فقال: ان كنت كاذباً فصيرك الله الى ماكنت.

وأتى الاقرع في صورته وهيئته. فقال له مثل ماقال لهذا. ورد عليه مثل مارد هذا. فقال: ان كنت كاذبا فصيرك الله الى ما كنت.

وأتى الاعمى في صورته وهيئته. فقال: رجل مسكين وابن سبيل وانقطعت بي الحبال في سفري. فلا بلاغ لي اليوم الا بالله. ثم بك. اسألك بالذي رد عليك بصرك: شاة أتبلغ بها في سفري. فقال: قد كنت اعمى فرد الله الي بصري. فخذ ما شئت. ودع ماشئت. فو الله لا اجهدك اليوم بشيء أخذته لله عزوجل. فقال: أمسك مالك. فانما ابتليتم. فقد رضي الله عنك وسخط الله عن صاحبيك: سێ کەس لەبەنی ئیسرائیل؛ بەڵەکێك و کەچەڵێك و کوێرێك، خودا دەیەوێ تاقییان بکاتەوە، جا فریشتەیێ لەشێوەی پیاوێك دەنێرێتە لایان، فریشتەکە دەچێتە لای بەڵەکەکەو پێی دەڵێ: زیاتر حەزت لەچییە؟ دەڵێ: حەزم لەڕەنگ و بۆیەکی جوان و پێستێکی جوانەو ئەم بەڵەکیەشم نەمێنێ، کەبۆتە هۆی ئەوەی خەڵك قێزو بێزم لێ بکەنەوە، فریشتەکە دەستی بەسەر دەهێنێ ئیتر دەنکە چەپەڵیەکی نامێنێو ڕەنگ و بۆیەکی جوان و پێستێکی جوانیشی پێ دەدرێ، ئەوجا فریشتەکە پێی دەڵێ: حەزت لەچ جۆرەماڵێکە؟ پیاوەکە دەڵێ: حەزم لە وشترە یا خود دەڵێ: حەزم لەڕەشەوڵاخە (ئیسحاق یەکێکە لەڕاویەکانی ئەم حەدیسە، گومانی لەوە بۆ پەیدا بو کەبەڵەك و کەچەڵەکە کامیان داوای وشترو کامیان داوای ڕەشەوڵاخی کردبو)، فەرموی: جا وشترەمێیەکی هەراشی ئاوسی لەسەر گوانی دایەو پێی گوت: خوا پیت و فەڕی تێ بخات.
ئینجا فریشتەکە دەڕوا بۆ لای کەچەڵەکەو پێی دەڵێ: زیاتر حەزی لەچییە؟ زیاتر حەزم لەقژێکی جوانەو ئەم کەچەڵییەشم نەمێنێ، کەبۆتە هۆی ئەوەی خەڵك قێزو بێزم لێ بکەنەوە فەرموی: جا فریشتەکە دەستی بەسەریدا دەهێنێ ؛ کەچەڵییەکەی دەڕواو قژێکی جوانیشی پێ دەدرێ، ئینجا پێی دەفەرموێ حەز لەچ جۆرە ماڵێك دەکەی؟ دەڵێ: لەڕەشەوڵاخ، جا مانگایەکی ئاوسی دەداتێ و پێی دەڵێ: خودا پیت و بەرەکەتی بۆت تێ بخات. ئینجا

فریشتەکە دەڕوا بۆلای کوێرەکەو پێی دەفەرموێ: ئەی تۆ حەزت لە چییە؟ دەڵێ: زیاتر حەزم لەدو چاوی ساغە کەخودا پێمیان بدات تا ئەم خەڵکەیان پێ ببینم، جا دەستێ بەچاوە کانیا دەهێنێ‌و خودا چاوەکانی دەداتەوەو، پێی دەفەرموێ: ئەی حەز لەچ جۆرە سامانێ دەکەی؟ دەڵێ: لەمەڕ، جا مەڕێکی زاوی بەرخ بەبەری دەداتێ، ئیتر بەرەبەرە ئاژەڵەکان زاوزێ دەکەن و ئەوانیش بەرهەمیان دەهێنن، زۆر دەبن ئەمیان بو بەخاوەنی پڕشێوێ وشترو ئەویان بو بەخاوەنی پڕدۆڵێ ڕەشەولاخ وئەوی تریشیان بوبە خاوەنی پڕشیوێ گەلەڕان، فەرموی: لەپاشدا فریشتەکە خۆی لێ گۆڕین و لەسەر شێوەی ئەوسای بەڵەکەکە خۆی هاتەوە لای و پێی گوت: پیاوێکی هەژاری داماوی ڕێبواری لێ قەوماوم، سەر بەهیچ لایەك دەرناکەم، مەگەر یەکەم بەپشتیوانی خوداو پاشان بەهۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە شوێن و ڕێی خۆم، جا تۆ بیت و ئەو کەسەی کەئەم شێوە جوانەو ئەم لەشە جوانەو ئەم ماڵە زۆرەی پێداویت وشترێکم بدەرێ، تا لەم سەفەرەمدا خۆمی پێ بگەیەنمە ماڵەوە، کابرا گوتی: خاوەن بەش زۆرن بەر تۆ ناکەوێ! فریشتەکەش فەرموی: وەك من تۆ بناسم وایە، ئەرێ تۆ ئەو پیاوە بەڵەکە نیت کەخەڵك بێزی لێ دەکردیەوە، وەئەو هەژارە نیت کەخودا دەوڵەمەندی کردیت! گوتی نەخێر! من ئەم ماڵ و سامانەم لەباب و باپیرەوە بۆ بەجێماوە، ئەوانیش هەر هەبو بون و پشتاوپشت بەبەگزادەیی هاتونەتە خوارەوە!فریشتەکەش دەڵێ: ئەگەر درۆ دەکەی خودا وەك جاری جارانی خۆتت لێ بکاتەوە. فەرموی: جا لەشێوەی پێشوی کەچەڵەکە چوە لای ئەویش، چی بەبەڵەکەکە گوت ئاواشی بەوگوت، وەبەڵەکەکە چی بەفریشتەکە گوت دیسان کەچەڵەکەش ئەوەی پێ گوت، فریشتەکەش گوتی: ئەگەر درۆ دەکەی خودا وەك جاری جارانی خۆتت لێ بکاتەوە! فەرموی: جا لەشێوەی پێشوی کوێرەکەشدا هاتەوە بۆلای و فەرموی: پیاوێکی هەژاری

داماوی ڕێبواری لێ قەوماوم، سەر بەهیچ لایەکدا دەرناکەم، مەگەر یەکەم بەپشتیوانی خوداو پاشان بەهۆی یارمەتی تۆوە، بگەمەوە شوێن و ڕێگەی خۆم، جا تۆ بیت و ئەوخودایەی کە چاوەکانی چاك کردیتەوە مەڕێکم بدێ بەشکو لەم سەفەرەمدا پێی بگەمەماڵەوە، پیاوەکوێرەکە دەڵێ: ئای منیش وەك ئێستای تۆ کوێر بوم و دەزانم کوێر چەندە کۆڵەوارە، وەخودا چاوی چاك کردمەوە، سەرەڕای ئەوە هەژاریش بوم و دەشزانم هەژاری چەندە ناخۆشە، جا بەئارەزوی خۆت چی دەبەی بۆ خۆت بیبە، وەچی بۆ من جێدێڵی ئارەزوی خۆتە، بەو خودایە هەرچی ئەمرۆ تۆ بیبەیت بۆ خۆت، لەڕێگەی خوادا دەست نایەنمە ڕێگەت فریشتەکە گوتی: ماڵی خۆت بۆ خۆت من فریشتەم ئاتاجی ماڵ نیم، تۆو بەڵەك و کەچەڵەکە، لەلایەن خودای گەورەوە تاقی کرانەوە، خودا لەتۆ خۆشنودو ڕازیە، بەلام لەهەردو هاورێکەت ڕەنجاوەو نارازیە".

## فریشتان گیانی مرۆڤ دەکێشن :

خودا کۆمەڵێك لە فریشتانی خۆی تایبەت کردون بەگیان کێشانی بەندان، هەرکاتێکی ماوەی ژینیان تەواو بو کەخوا بۆی خەملاندون، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ قل يتوفاكم ملك الموت الذي وكل بكم ثم الى ربكم ترجعون: بڵێ، فریشتەی گیان کێشان کەبەئەنگۆ ڕاسپێردراوە گیانتان دەکێشێ، لەپاشان بۆلای پەروەردگارتان دەگەڕێنەوە ﴾ سورة السجدة/١١.

ئەوانەی گیان دەکێشن لەفریشتەیەك زێترن ﴿ وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لاَ يُفَرِّطُونَ، ثُمَّ رُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلاَهُمُ الْحَقِّ أَلاَ لَهُ الْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ الْحَاسِبِينَ وەهەرئەوە زاڵە بەسەر

بەندەکانیداو چاوەدێرانتان لەسەر دادەنێ، تاکاتێك مەرگی یەکێك لەئێوە دەگا، نێردراونی ئێمە گیانی دەستێنن و ئەوانە لەنوسینی کردەوەی بەندەکان کۆتایی ناکەن، ئەوسا هەمو بەندەکان بۆلای خودا کە گەورەی ڕاستینی ئەوانە دەگەڕێندرێنەوە، ئاگاداربن! داوەری کردن تایبەتی ئەوەو هەر ئەویشە بەلەزترینی حسێبگەران ﴾ سورة الانعام/٦١-٦٢.

جا فریشتەکان زۆر بەتوندی و دژواری و دور لەهەمو نەرمی نواندنێك گیانی بێ بڕواو تاوانکاران دەکێشن ﴿ . . وَلَوْ تَرَى إِذْ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلائِكَةُ بَاسِطُوا أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمْ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ . . : خۆزگە دەتبینی کەئەم ستەمکارانە لەپەلەقاژێی مەرگ دان چلۆن گرفتاربون و فریشتەش دەستیان بۆ درێژدەکەن و پێیان دەڵێن: وەخۆتان لەگیان کێشان ڕزگاربکەن، ئەمڕۆ بەدەردو ئەشکەنجەیەکی پەست کەرەوە سزا دەدرێن ﴾ سورة الانعـــام/٩٣. هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ تَرَى إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا الْمَلائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ: ئەگەر لەسەرە مەرگدا کافرانت دەدیتن کە فریشتەکان دەیانمرێنن، لەدەم و چاو وپشتیان دەدەن و دەڵێن: ئازاری سوتێنەر بچێژن ﴾ سورة الانفال/٥٠.

دیسان دەفەرمێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمْ الْمَلائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ: جا چۆن دەبن کاتێ کەفریشتەکان بیان مرێنن و لەسەرو چاوو پشتیان بسرەوێنن ﴾ سورة محمد/٢٧. هەرچی باوەڕدارانیشن، فریشتەکان بەنەرمی و میهرەبانیەکی زۆر گیانیان دەکێشن.

## موژدەدانی فریشتان بەبڕواداران لەکاتی گیان کێشانیّ:

کەمەرگ دێو دەگاتە بەندەی بڕوادار، فریشتەکان دادەبەزنە سەری و مزگێنی و موژدەی پیّ دەدەن و جێگیری دەکەن: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ، نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ: بەڕاستی کەسانێکی کەگوتیان؛ پەروەردگاری ئێمە خودایەو پاشان خۆیان ڕاگرت و جێگیربون. فریشتە دێنەسەریان و پێیان دەڵێن: مەترسێن و خەم مەخۆن و مزگێنی بیّ لێتان بەوبەهەشتەی بەڵێنتان پیّ درابو، ئێمە یارو پشتیوانی ئێوەین لەدونیاو لەئاخیرەت دا، هەرچی دڵتان بیەویّ لەبەهەشتێدا بۆتان هەیەو هەرچی بخوازن بۆتان تێیدا دانراوە﴾ سورة فصلت/٣٠-٣١.

موژدەی دۆزەخ و خەشم وتوڕەیی خودای زالّ و بەدەسەلاّتیش دەدەنە بیّبروایان وپێیان دەڵێن: ﴿..أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمُ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ..: خۆتان دەربازبکەن، ئەمڕۆ بەدەردو سزایەکی پەستکەرەوە سزا دەدرێن﴾ سورة الانعام/٩٣.

## موسا چاوی فریشتەی مەرگ دەردێنیّ:

بوخاریو موسلیم لەصەحیحەکانیاندا لەئەبوهورەیرەﷺ دەگێڕنەوە دەڵیّ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: "جاء ملك الموت الى موسى بن عمران. فقال له: أجب ربك. قال: (فلطم موسى عين ملك الموت ففقأها) قال: (فرجع الملك الى الله، فقال: انك ارسلتني الى عبدلك لايريد الموت، وقد فقأعيني ) قال: (فرد الله اليه عينه.

وقال: ارجع الى عبدي فقل: الحياة تريد؟ فان كنت تريد الحياة فضع يدك على متن ثور. فما توارت يدك شعرة فانك تعيش بها سنة (وفي البخاري: فله بما غطت يده لكل شعرة سنة) قال: ثم مه ؟ قال: ثم تموت. قال: فالآن قريب: **فریشتەی گیان کێشان هاتەلای موسای کوڕی عیمران و، پێی گوت: وەڵامی پەروەردگارت بدەوە، دەفەرمێ: موسا زللەیەکی لەچاوی فریشتەی مردن داو چاوی دەرهێنا. دەفەرمێ: فریشتەکە گەڕاوە لای خوداو پێی گوت: تۆمنت بۆلای بەندەیەکی خۆت هەنارد کەنایەوێ بمرێ و چاوی منیشی دەرهێنا. دەفەرمێ: جا خوا چاوەکەی داوەو، فەرموی: بڕۆ بۆلای بەندەکەم و پێی بڵێ: ژیانت دەوێ؟ ئەگەر ژینی دونیات دەوێ، دەستت لەسەر پشتی گایەك دانێ، چەند تاڵەموی شاردەوە. بەهەر تاڵە موێك، ساڵێك بژی. موسا گوتی: ئەدی پاشان؟ گوتی: پاشان دەمری، موسا گوتی: دەنا ئێستێ نێزیکترە".**

**دیارە فریشتەی مەرگ لەوێنەی مرۆڤ هاتۆتەلای موسا، هەر وەك بەڕیوایەتێکی صەحیح لەموسنەددا هاتوە، ئەوەی موساش کردویەتی لەبەر هەندێ بوە، پێغەمبەران سەرپشك دەکرێن پێش ئەوەی گیانیان بکێشرێ، لەنێوان دونیاو لەوەی لای خودا هەیە. ڕەنگە خەڵکانێك هەبن ئاوەزیان ئەم ڕیوایەتە هەڵنەگری و وەدرۆی بێخنەوەو، لەبیریان چوە یەکەمین سیفەتی خۆپارێزان ئەوەیە باوەڕ بەغەیبێ دێنن. هەروەك خوای گەورە لەسەرەتای سورەتی بەقەرەدا باسی کردوە. هەرکاتێکی هەواڵێکی ڕاست لەخودا یان لەپێغەمبەرەکەیەوە هات، جگە لەباوەڕپێکردن و بەڕاستدانان چی دیکە نامێنێ:** ﴿. .وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُوا الأَلْبَابِ: **ئەوانەی بەزانستدا ڕۆچون و ڕیشەیان تێداکوتاوە، دەڵێن: ئێمە بڕوامان بەهەمویان هێناوە، هەموی لەلای پەروەردگاری ئێمەوەن و، تەنیا ژیران بیردەکەنەوە** ﴾ سورة آل عمران/٧.

**پرسیاری فریشتان بۆ بەندە لەنێوگۆڕو کاروباریان لەڕۆژی پەسڵان و لـــە بەهەشت و لەدۆزەخدا:**

لەباس و تۆژینـەوەی باوەڕ بەرۆژی دواییـدا "ان شـاء الله تعـالی" باسـی ئـەوە دەکـەین، فریشـتەکان چیـان لەسـەرە بەرامبـەر بـەندان پـاش مردنـیٚ، لەپرسـیارکردنی هـەردو فریشـتە کەمونکەرونـەکیرن بـۆ بـەندە، لـەنێوگۆری خۆیدا. هەروەها باسی ئەو فریشتانەش کەبەندەکان لەگۆڕدا شـادو بەهرەوە دەکـەن و، ئەوانـەش کـەبیٚ بـڕواو تاوانبـاران ئەشـکەنجە دەدەن، ئەوانـەش کەلـەڕۆژی دوایـیـدا پێشـوازی لـە بـاوارِداران دەکـەن، وەباسـی فوکردنـی ئیسـرافیل بەشـەیپورداو، کۆکردنـەوەی خـەڵکی لەلایـەن فریشـتانەوە بـۆ لیٚ پرسـینەوەو، ڕامـاڵین و ئـازوانی بـیٚ بـاوەڕان بـۆ جەهەننـەمیٚ و، بردنـی باوەڕداران بۆ بەهەشتیٚ و، ئازارو ئەشکەنجەدانیان بۆ بیٚباوەڕان لـەدۆزەخ داو، سلاوکردنیان لەئیمانداران لەبەهەشت دا.

## فریشتەکان و بڕواداران

لەباسی پێشو لەبارەی ئەوە ئاخاوتین کەخوای گەورە فریشتانی پـیٚ ئەرکبارکردوە، لەئاست ئادەمییان بەگشتی بـەباوەڕدارو بێبڕوایانـەوە. جـا ئـەوەی باسمـان کـرد لەرێکخسـتنی تـۆم و، پـارازتنی بـەندان و، گـەیاندنی سـروش و، چـاودێریکردنی بـەندان و نوسـینی کـردان و، کێشـانی گیـان، تایبەت نین بەبەشێکی مرۆڤ و بەشـەکەی دی لیٚ بیٚبەش بن و، تـەنیٚ لەمـەڕ بڕوادارانیش نین و کافران نەگرنەوە.

پاش ئەوانـەش فریشـتەکان ڕۆڵـی جوایـەزیان هەیـە، لەگـەڵ هەریـەکـە لەبڕواداران و بیٚ بڕوایـان. جـا ڕۆڵـەکانیان لەئاسـت هـەر تیپێکیـان دەخـەینـە بەر باس و ڕون و ئاشکرایان دەکەین.

## خۆشویستنی فریشتان بۆ بڕواداران:

بوخاری وموسلیم لەصەحیحەکانیاندا لەئەبوهورەیرەﷺ دەگێرنەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "ان الله تبارك وتعالى اذا احب عبداً نادى جبريل: ان الله قد احب فلاناً فاحبه. فيحبه جبريل. ثم ينادي جبريل في السماء: ان الله قد احب فلاناً فاحبوه. فيحبه اهل السماء. ويوضع له القبول في الارض: ئەگەر خودای بێخەوش و بەرزبەندەیەکی خۆشویست بانگ دەکا جیبریل؛ خودا فلانە کەسی خوشویست تۆش خۆشت بوێ. جا جیبریل خۆشی دەوێ. پاشان جیبریل لەئاسمانێدا بانگ دەکا: کەخودا فلانە کەسی خۆشویست، ئێوەش خۆشتان بوێ، جا ئاسمان نشینەکان خۆشیان دەوێ و چونە دلان و قبولکردنێکی بۆ لەزەویشدا بۆ دادەنرێ".

## ڕاستکردنەوەی بڕوادار لەلایەن فریشتانەوە:

تیرمیذی و ئیبنیماجە دەگێڕنەوە، کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی: "من سأل القضاء وكل الى نفسه، ومن أجبر عليه يترل الله عليه ملكاً فيسدده: ئەوکەسەی بەخۆی داوای قازیەتی کرد، بەخۆی دەسپێردرێ. بەلام ئەوەی بەزۆر پێیان کرد، خودا فریشتەیەکی بۆ دادەبەزێنێ و ڕاستی دەکاتەوە". چۆنیەتی ڕاستکردنەوەکەش، هەر خودا پێی زانایە.

ئەو فەرمودەیەش هەر لەو بابەتەیە. کەبوخاری لەصەحیحەکەیدا، لەئەبوهورەیرەدا ﷺ دەیگێرتەوە، دەلێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "قال سليمان بن داود عليهما السلام: لأطوفن الليلة بمائة امرأة. تلد كل امرأة غلاماً يقاتل في سبيل الله.

فقال الملك: قل ان شاء الله. فلم يقل ونسي. فطاف بهن. ولم تلد الا امرأة منهن نصف انسان.

قال النبي ﷺ لو قال: ان شاء الله لم يحنث وكان ارجى لحاجته: سلێمانی کوڕی داود عليه السلام گوتی: ئەمشۆ بەسەر سەد ژناندا دەگەڕێم، هەر ژنێکیان کوڕێکی دەبێ لەپێناو خوادا بجەنگێ. فریشتەکە پێی گوت: بڵێ: (ان شاء الله) ئەگەر خودا بیوێ، (ان شاء الله)ی نەکردو لەبیری کرد، پاشان بەسەر هەمواندا سوڕاوە، بەڵام کەسیان منداڵیان نەبو لەیەکێکیان بترازێ کە نیوە مرۆڤێکی بو.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەگەر بیگوتبا: (ان شاء الله) قسەکەی نەدەشکاو زیاتر مایەی دەسکەوتنی حاجەتەکەی بو".

لێرەدا دیارە فریشتەکە سلێمانی پێغەمبەری خوای ڕاست کردۆتەوەو بۆ تەواوی ڕێنوێنی کردوە.

## درودناردنیان بۆ بڕواداران:

خودا هەواڵی پێ داوین، کەفریشتەکان درود بۆ پێغەمبەر ﷺ دەنێرن: ﴿ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا: بەراستی خوداو فریشتەکانی درود بۆ پێغەمبەر دەنێرن ﴾ سورة الاحزاب/٥٦.

هەروەها فریشتەکان درود بۆ بڕوادارانیش دەنێرن: ﴿ هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُمْ مِنْ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا: خودا زاتێکە خۆی و فریشتەکانی درودورەحمەت بۆ ئێوە دەنێرن، تا ئێوە

**لەتاریکیـەوە دەربێنـێ و بـەرەو ڕونـاکی ڕێنوێیـتـان بکـا. وەلەمـەڕ بـڕواداران بەبەزەییە** ﴾ سورة الاحزاب/٤٣.

**دروودی خـودای بـەرزیش بـۆ بـەندەکانی ئەوەیـە کەلـەلای فریشـتان ستایشیان بکا، هەروەك بوخاری لـە ئەبولعالیـە دەیگێڕتـەوە.هـی دیکـەش دەڵێن: درود لـەخودای بەرزەوە، میهرو بەزەییـە، دەشـگوترێ: تێـك گـیربون لەنێوان هەردو گۆتان دا نیە.**

**دروودی فریشـــتانیش بـــۆ خـــەڵکی بـــەمانای نزاکـــردن و داوای خوالێخۆشبونە بۆ بەندان. لێرە بەدوا ئەمانە ڕون دەکەینەوە.**

## نمونەگەلێك لەو کردەوانەی، مایەی درودی فریشتانن

### ئەوەی خەلکی فێری چاکە دەکات:

**طەبـەرانی و تیـرمیذی بەسـەنەدی صـەحیح لەئەبوئومامـەوە دەگێڕنـەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** "ان الله وملائكته. حتى النملة من جحرها. وحتى الحـوت في البحر. ليصلون على معلم الناس الخـير: **خـودای گـەورەو فریشـتەکانی، تەنانـەت مێرو لـە شـاری خـۆی و، تەنانـەت ماسـی لـەدەریادا، درود بـۆ ئـەو کەسـەی دەنێرن کەخەڵکی فێرە چاکە دەکا** " (صحيح الجامع ١٣٣/٢).

### ئەوانەی بۆ نوێژێ دەچنە مزگەفتان:

**لەصەحیحی موسلیم دا هاتوە:** "أن الملائكة تصلي على الذي يأتي المســـجد للصلاة فتقول: اللهم صل عليه. اللهم ارحمه. مالم يؤذ فيه مالم يحـــدث فيــه: **فریشتە درود بۆ ئەو کەسە دەنێرن کەبۆ نوێژکردن دێتە مزگەفتێ و، دەڵێ: خودایە..**

درودی بۆ بنێره، خودایه . رەحمی پێ بکه. هەروایه ئەگەر کەسی تێدا ئەزیەت نەداو، دەستنوێژی نەشکا".

## ئەوانەی لەڕیزی یەکەم نوێژ دەکەن:

لەسونەنی ئەبوداودو ئیبنیماجەو موسنەدی ئەحمەددا، لەبەڕائ ﷺ هاتوه، کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی: "ان الله وملائکته یصلون علی الصف الاول: خوداو فریشتەکانی درودورەحمەت دەنێرن بۆ ریزی یەکەمی نوێژکەران" (صحیح الجامع ۲/۱۳۳).

لەسونەنی تیرمیذیشدا هاتوه: "ان الله وملائکته یصلون علی الصف المقدم: خوداو فریشتەکانی درودو سلاو بۆ ریزی پێشەوە دەنێرن" (صحیح الجامع ۲/۱۳٤).

## ئەوانەی لە پاش نوێژەکان لەنوێژگەکانیان دەمیننەوە:

ئەبوداود و نەسائی لەسونەنەکانیان دا، بەسەنەدێکی صەحیح لەئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە، کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی: "الملائکة تصلي علی احدکم مادام في مصلاه الذي صلی فیه. مالم یحدث. او یقم: اللهم اغفر له. اللهم ارحمه: فریشتەکان درود بۆ هەریەکێکتان دەنێرن تاکو لەنوێژگەکەی بێ کەنوێژی تێدا کردوە، هەتا دەستنوێژی دەشکێ یا هەڵدەستێ، بۆی دەپاڕێنەوەو دەڵێن: خوایە لێی خۆش بە، خوایە رەحمی پێ بکە" (صحیح الجامع ٦/٢١).

## ئەوانەی بۆشایی نێوان ریزەکان پڕدەکەنەوە:

لەسونەنی ئیبنیماجەو موسنەدی ئەحمەدو موستەدرەکی حاکیم دابەسەنەدێکی چاك لەعائیشەوە(رضي الله عنها) هاتوه، کەپێغەمبەر ﷺ

دەفەرمێ: "ان الله تعالى وملائكته يصلون على الذين يصلون الصفوف. ومن سد فرجة رفعه الله بها درجة: **خودای بەرزو فریشتەکانی درود لەسەر ئەوان کەسان لێ دەدەن کەریزەکان بەیەك دەگەیەنن، هەرکەسێکی بۆشایی یەکیش پڕکاتەوە خودا پلەیەکی پێ بەرز دەکاتەوە** "(صحيح الجامع ٢/١٣٥).

## ئەوانی پاشێو دەخۆن:

**لەصەحیحی ئیبنی حیببان و (معجم الاوسط)ی طەبەرانی بەسەنەدێکی چاك لەئیبنیعومەرەوە‌ هاتوە، کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی:** "ان الله تعالى وملائكته يصلون على المتسحرين: **خودای بەرزو فریشتەکانی درود دەنێرن بۆ ئەو کەسانەی بۆ رۆژی پاشێو دەخۆن** " (صحيح الجامع ٢/١٣٥).

## ئەوانەی درود لە پێغەمبەر ﷺ دەدەن:

**ئەحمەد لەموسنەدەکەی و (الضیاء) لە (المختارة)دا بەسەنەدێکی چاك لەعامیرِی کوڕی رەبیعە دەیگێڕنەوە، کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی:** "مامن عبد يصلي علي الا صلت عليه الملائكة. مادام يصلي علي. فليقل العبد من ذلك او يكثر: **هەر بەندەیەکی درود لەسەر من لێبدا، فریشتەکان درودی لەسەر لێ دەدەن تا درودم لەسەر لێ بدا، جا ئەو بەندەیە زۆر ئەو کارە بکا یان کەم**" (صحيح الجامع ١٧٤/٥).

## ئەوانەی نەخۆشان بەسەر دەکەنەوە:

**ئیبنی حیببان لەصەحیحەکەیدا بەسەنەدێکی صەحیح لەعەلی یەوە دەگێڕتەوە، کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی:** "مامن امرىء مسلم يعود مسلماً الا ابتعث اليه سبعين الف ملك. يصلون عليه في أي ساعات النهار كان. حتى يمسي. واي ساعات الليل كان. حتى يصبح: **هەر مرۆڤێکی موسوڵمان نەخۆشێکی موسوڵمان بەسەرکاتەوە، خودا هەفتا هەزار فریشتە دەنێرێ تا درودی لەسەر لێ بدەن،**

**جا لەهەر کاتێکی رۆژدابێ تاکو دەگاتە هێوارە لەهەر کاتێکی شەودابێ، هەتا دەگاتە بەیانی"** (صحيح الجامع ٥/١٥٩).

**لەریوایەتێکی ئەبوداود و حاکیم دا هاتوە** "مامن رجل يعود مريضاً ممسياً. الاخرج معه سبعون الف ملك يستغفرون له حتى يصبح. ومن أتاه مصبحاً خرج معه سبعون الف ملك. يستغفرون له حتى يمسي: **هەرکەسێکی هێوارەیەك سەردانی پیاوێکی نەخۆش بکا، هەفتا هەزار فریشتەی لەگەل دەردەچن و هەتا بەیانی داوای لێ خۆش بونی بۆ دەکەن. ئەو کەسەی بەسبەینەش چوە سەردانی نەخۆش. هەفتا هەزار فریشتەی لەگەل دەردەچێ و، تا هێوارە دادێ داوای لێخۆش بونی بۆ دەکەن".**

## ئایا درودی فریشتان بۆ ئێمە چ شون و کاریگەری هەیە ؟

**خوای بەرز دەفەرموێ:** ﴿ هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا: **خودا زاتێکە خۆی و فریشەکانی درودو رەحمەت بۆ ئێوە دەنێرن تاکو ئێوە لەتاریکی دەربێنی بەرەو روناهی** ﴾ سورة الاحزاب/٤٣.

**ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوە دەگەیەنێ، کەخودا لەجیهانی بالادا یادمان دەکاو، پارانەوەی فریشتەکانیش بۆ بڕواداران وداوای خوا لێخۆشبونیان. شون و کاریگەری هەیە لە رێنوێنی کردنمان و، رزگارکردنمان لەتاریکی کەمانای بێ بڕوایی و هاوبەش دانان و گوناە و تاوان و یاخیبونە، بۆ ئەو روناهی یەی کەمانای رونی بەرنامەو رێگایە بۆ ناسینەوەی راستەرێی رەوا کەئیسلامە، لەگەڵ زانینی ئەوەی خودا چی لێمان مرازەو، ئەو روناکییەشمان پێ دەبەخشێ کەرێنماییمان دەکا بۆ ناسینەوەی حەق وراستی لەکردارو گوفتارو کەسەکانیش.**

## ئامین گوتن بۆ نزای بڕواداران:

فریشتەکان ئامین دەکەن بۆ پاڕانەوەی بڕواداران، بەمەش نزایەکە نێزیکتر دەبتەوە لەقبوڵبون، لەسونەنی ئیبنیماجە لەئەبودەردا ﷺەوە هاتوە، کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی: "دعوة المرء مستجابة لاخيه بظهر الغيب. عند رأسه ملك يؤمن على دعائه. كلما دعا له بخير قال: آمين. ولك بمثله: هەر کەسێك لەغەیبەوە دوعا بۆ براکەی بکا، دوعاکەی قبوڵە، فریشتەیەك لەلای سەریەوە ئامین بۆ دوعاکەی دەڵێ، هەرکە دوعایەکی خێر بۆ براکەی بکا، فریشتەکە دەڵێ: ئامین، وەك ئەویش بۆ تۆ".

لەبەرئەوەی نزای ئامین لێکراو شایانە قبوڵ ببێ، نابێ بڕوادار دوعای خراپ لە خۆی بکا، لەصەحیحی موسلیم دا هاتوە لەئوم سەلەمەوە گوتی: بەچاکە نەبێ نزا بۆخۆتان مەکەن، چونکە فریشتەکان ئامین دەکەن لەوەی ئێوە دەیلێن.

## داوای بەخشینیان بۆ بڕواداران:

خودا پێی ڕاگەیاندوین فریشتەکان داوای لێبوردن دەکەن بۆ زەوینشینیان ﴿ تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْ فَوْقِهِنَّ وَالْمَلَائِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَنْ فِي الْأَرْضِ أَلَا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ : نێزیکە ئاسمانەکان لە بەرابەر گەورەیی خودا لەبانەوە پڕش و بڵاوبنەوە. فریشتەکان هەردەم پاکیو بێخەوشی و سوپاسی پەروەردگاری خۆیان بەجێ دێنن و، بۆ ئەوان کەسانی وا لەزەوی دان داوای لێ بوردن دەکەن. ئاگاداربن، بەڕاستی خودا هەر خۆی لێبوردەو خاوەنی بەزەییە ﴾ سورة الشورى/٥.

هەروەها لەئایەتێکی سورەتی غافیردا هەواڵی پێداوین کەهەڵگرانی عەرش و فریشتەکانی دەوروبەری عەرش، خودا بەپاك و بێخەوش دەگرن و مل کەچی بۆ دەکەن و، بەتایبەت دوعای لێخۆش بون بۆ بڕواداره ژیوانەکان دەکەن و لەخوا دەپاڕێنەوه لەدۆزەخێ ڕزگاریان کاو بیانباتە بەهەشتێ و بیانپارێزێ لەخراپەکاری و گوناهان: ﴿ الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَحْمَةً وَعِلْمًا فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ، رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدْتَهُم وَمَنْ صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ، وَقِهِمُ السَّيِّئَاتِ وَمَنْ تَقِ السَّيِّئَاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ: ئەوانەی کەعەرش هەڵدەگرن و ئەوانی بەدەوری یەوەن. پاکیگاری‌و ستایشی پەروەردگاریان دەڵێن، وەبڕوایان بەوهەیەو، داوای لێ خۆش بون دەکەن بۆ بڕواداران و دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! بەزەیی و زانستت هەمو شتی داگرتوه، جا ئەوانەی ژیوانن و هاتونە سەر ڕێگای تۆ، بیان بەخشەو لەئاگری دۆزەخ بیانپارێزه. ئەی پەروەردگاری ئێمە، ئەوانە ببە ناو ئەو بەهەشتەی بەڵێنت پێ دابون، هەروەها چاکەکەرانی باوباپیرانی ئەوان و خێزان و زارۆکانیان، بەڕاستی هەرتۆ عەزیزو حەکیمی. وەئەوانە لەبەدی بپارێزەو، لەو ڕۆژەدا هەرکەسێکی تۆ لەبەدی بیپارێزی بەحەقیقەت روحمت پێ‌کردوەو، هەر ئەمەیە کامەرانی و سەرکەوتنی گەورەو مەزن ﴾سورةغافر ٧-٩

**ئامادەبونیـان لـەکۆڕی زانسـت و بازنـەی زیکـرو بـاڵ داهێنانیـان بەسەریاندا:**

لەهـەردو صـەحیحی بوخـاری و موسـلیمدا لەئـەبوهورەیرەﷺ لەپێغەمبەرﷺ فەرموی: "ان لله تبارك وتعالى ملائكة يطوفون في الطرق. يلتمسـون اهل الذكر. فاذا وجدوا قوما يذكرون الله تعالى تنادوا: هلموا الى حـاجتكم. قـال: فيحفونهم باجنحتهم الى السماء الدنيـا: خـوای بێخـەوش و بەرز فریشـتەی هـەن، بەکۆڵاناندا دەگەڕێن، بەدوای ئەهلی زیکرو یادی خودا، جا ئەگەر قەومێکیان دیتـەوە زیکرویـادی خـودای بـەرز بکـەن. بـانگی یـەك دەکـەن: وەرن بۆئـەوەی دەتانویست. فەرموی: جا تا ئاسمانی دونیا باڵەکانیان بەسەردا دەهێنن".

لەصـەحیحی موسلمیشـدا لەئـەبوهورەیرەﷺدەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرموی: "وما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله ويتدارسونه بينهم الا نزلت عليهم السكينة. وغشيتهم الرحمة. وحفتهم الملائكة. وذكرهم الله فيمن عنـده: وەهـەر هۆزێك لـەماڵێك لەماڵەکانی خـودا کۆبنـەوەو قورئـان بخوێنـن ولـەنێو خۆیان لێی بکۆڵنەوە ئارامی دادەبەزێتە سەریان و، رەحمەت دایان دەپۆشێ و فریشـتە سێبەریان لێ دەکـەن و، خـودای گـەورە لـەنێو ئـەوانی لای خـۆی یادیان دەکا".

لەموسـنەدی ئەحمـەد و سـونەنەکاندا بەمـەرفوعی لەئەبودەردائـەوە هاتوە: "ان الملائكة لتضع اجنحتها لطالب العلم رضـاء بمـا يصنـع: فریشـتەکان باڵـەکانی خۆیـان ڕادێخـن بـۆ فـێرخوازان، هێنـدە لەکردەوەکـەیان ڕازیـن و خۆیان لەئاست بەکەم دادەنێن".

واتە کردەوەو کرداری چاك فریشـتان لەئێمـە نزیك دەکاتـەوەو ئێمـەش لەوان نێزیك دەکاتـەوە. ئەگـەر بـەندەکانیش لـەبارێکی بـاڵای بەرزبونـەوەی گیـانی بـەردەوام بونایـە. دەگەیشـتنە پایـەی دیتـنی فریشـتان، هـەروەك لـەو

**فـەرمودەیدا هـاتوە کـەبوخاری و موسـلیم و هـی دیکـەش لەئەنــەس ﷺەوە دەیگێڕنەوە، لەپێغەمبەرەوە ﷺ فەرموی:** "لو انكم اذا خرجتم من عندي تكونون على الحال الذي تكونون عليه. لصافحتكم الملائكة بطرق المدينـــة: **ئەگەر بێتـو ئێوە کەلـەلای مـن دەچنـەدەرێ، هــەر لەســەر هــەمان ئــەو بــارەبن کەلـەلای مــن لەسەرینە، ئەوا فریشتەکان لەڕێگاکانی مەدینەدا دەستتان دەگوشن"** (صحيح الجامع ٥/٥٩).

**لەسونەنی تیرمیذیشدا لەئەبوهورەیرەوە بەسەنەدێکی صەحیح هاتوە:** "لو انكم تكونون على كل حال على الحالة التي أنتم عليها عندي. لصافحتكم الملائكـة باكفهم. ولزارتكم في بيوتكم. ولو لم تذنبوا. لجاء الله بقوم يذنبون كي يغفر لهم: **ئەگەر ئێوە هەمو دەمیٚ لەسـەرئەوبارە بمابانـەوە، کـەئێوە لـەلای مـن لەسـەری دان، ئەوا فریشـتەکان بەدەسـتی خۆیـان تۆقـەیان لەگـەڵدا دەکردن و، لەماڵـەکانی خۆتــان ســەردانیان دەکــردن، وە ئەگــەر ئێــوە گوناهتــان نــەکردبا، خـــودا قەومێکی دەهێنا گوناهیان کردبا، تاکو لێیان ببوریٚ** " (صحيح الجامع ٥/٦٠).

## تۆمارکردنی ئەوانەی دێنە هەینی لەلایەن فریشتانەوە:

**ئـەو فریشـتانە هـەندێك کـردەوەی بـەندان تۆمـار دەکـەن، جـا ئـەوانی بـۆ نوێـژی هـەینییان دێـن یـەك بـەدوای یـەك تۆماریــان دەکــەن. لەصـــەحیحی بوخـاری لەئـەبوهورەیرەوە ﷺ هـاتوە، دەڵـیٚ: پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمویٚ:** "اذا كان يوم الجمعة كان على كل باب من ابواب المسجد ملائكة يكتبون الاول فـــالاول. فاذا جلس الامام طووا الصحف وجاءوا يســـــتمعون الذكـــر: **ئەگـەر ڕۆژی جومعـە دادیٚ، لەسـەر هـەر دەرگـەیـەك لەدەرگـەکانی مزگـەوتیٚ، فریشـتە گـەلێك هــەن، یـەك لـەدوای یـەك ئەوانـە دەنوسـن کەدەچنـە مزگـەفتیٚ، کـەئیمام دانیشـت، تێنوسەکانیان دادەخەن و دێن گویٚ لەیادی خوا دەگرن".**

هەروەها هەر قسەیەکی باشی بەندان تۆمار دەکەن. لەصەحیحی بوخاری و هی دیکەش دا لە رەفاعەی رافیعی زەرقی یەوە هاتوە دەڵێ: (رۆژێك لەپشت پێغەمبەر ﷺ نوێژمان دەکرد کاتێ کەسەری لەکڕنوش بەرزکردەوە، فەرموی: (سمع الله لمن حمده). پیاوێك لەپشتی بو گوتی: ربنا ولك الحمد حمداً کثیراً طیباً مبارکاً فیه. کەتەواو بو فەرموی: کێ بو وای گوت؟ کابرا گوتی: من، فەرموی: (لقد رأیت بضعة وثلاثین ملکاً یبتدرونها ایهم یکتبها: سی و ئەوەندە فریشتەیەم دیت، هەریەك دەیویست بینوسێ).

جا ئەم نوسەرانە کە لەفریشتانن بێگومان جودان لەو دو فریشتەی کردەوەی چاك و خراپ تۆمار دەکەن، چونکە ئەمانە سی‌و ئەوەندە فریشتەیەن

## بەدوایەکدا هاتنی فریشتان بۆ لای ئێمە:

ئەو فریشتانەی بەرێگاکاندا دەسوڕێنەوە بەدوای زیکرو یادی خوداو لەجومعەو جەماعەتان ئامادەدەبن، بەدو یەك دادێن و چینێك دێنە لامان و چینێك دەرۆن و، ئەوانە لەنوێژی سبەینان و نوێژی عەسران دا کۆدەبنەوە، لەهەردو صەحیحی بوخاری و موسلیم دا لە ئەبوهورەیرە‌ﷺ هاتوە. پێغەمبەرﷺ فەرموی: "یتعاقبون فیکم ملائکة باللیل وملائکة بالنهار. ویجتمعون في صلاة العصر وصلاة الفجر. ثم یعرج الذین باتوا فیکم فیسألهم وهو اعلم بهم. فیقول: کیف ترکتم عبادي؟فیقولون: ترکناهم وهم یصلون وآتیناهم وهم یصلون: فریشتەکان لەشەو و لەڕۆژدا یەك لەدوای یەك دێنە لاتان و، لەنوێژی عەسرو نوێژی سپێدە کۆدەبنەوە، پاشان ئەوانەی شەویان لەناو ئێوەدا کردۆتەوە بەرەو ئاسمانێ هەڵدەکشێن، خودا هەر خۆشی زاناترە لێیان دەپرسێ و دەفەرموێ: چۆن بەندەکانی منتان بەجێ هێشت؟ دەڵێن: بەجێمان هێشتن نوێژیان دەکردو کەچوینە لاشیان هەر نوێژیان دەکرد".

رەنگە هەر ئەو فریشتانە بن کردەوەی بەندەکان بۆ پەروەردگاریان بەرز بکەنەوە. لەبوخاری و موسلیم دا لەئەبوموسای ئەشعەرییەوە ﷺ دەڵێ[٢]:
"قام فينا رسول الله ﷺ باربع كلمات. فقال: ان الله لاينام ولاينبغي لـــــه ان ينـــــام. يخفض القسط ويرفعه. يرفع اليه عمل النهار قبل الليل. وعمل الليل قبل النـــــهار ...:
پێغەمبەر ﷺ لەناومان هەستاوەو چوار وشەی پێ فەرموین؛ خودا نانوێ وناشبێ بنوێ. بەشەکان بەرزدەکاتەوەو نەویان دەکا. کردەوەی رۆژی پێش شەوداهاتن بۆ بەرزدەکرێتەوەو، کردەوەی شەویش پێش رۆژداهاتن".

جا خودای گەورە نوێژی بەیانی بەمەزن و رێزدار داناوە، چونکە فریشتەکان تێیدا ئامادە دەبن. لەم بابەتەش دەفەرمێ: ﴿ ..وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا: هەروەها نوێژی سپێدەی بەیانان بخوێنە، چونکە نوێژی سپێدەی بەیانان بینراوەو فریشتەکانی شەوو رۆژ لەو نوێژەدا ئامادەدەبن ﴾ سورة الاسراء/٧٨.

## دابەزینی فریشتان کەئیمانداریك قورئان دەخوێنێ:

فریشتەکان هی وایان تێدایە لەکاتی قورئان خوێندن، لەئاسمانێ دادەبەزن، لەئەبوسەعیدی خودریەوە ﷺ هاتوە، جارێك ئوسەیدی کوڕی حوضەیر لەجۆخینەکەیدا قورئانی دەخوێند، دیتی ماینەکەی هەڵبەزدابەزان دەکا، بەردەوام بو لەقورئان خوێندن، دیسان هەڵبەزی، هەر خوێندنی، دیسان بازیدا، ئوسەید دەڵێ: لەوەی ترسام پێ لەیەحیا بنێ، بۆیە هەستام چومە لای، هەستم کرد شتێکی وەك سێبەرم لەسەرسەرە، شتی وەکو چرای تێدایەو بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێ هەتا لەچاوم ونبو. گوتی: جا گەڕامەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا دوێنێ شەوێ لەمشتاخەکەمدا قورئانم دەخوێند، هەسپەکەم هەڵدەبەزی! پێغەمبەر ﷺ

فەرموی (اقرا یا ابن حضـیر: بخوێنـه كوڕی حوضـەیر). دەڵـێ: جا خوێنـدم و، دیسان هەسپەكەم هەڵبەزی، جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (اقرا یا ابـن حضـیر: بخوێنـەوە كـوڕی حوضـەیر). دەڵـێ: خوێندمـەوە، دیسـان هەسـپەكەم هەڵبەزیەوە. دیسان پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (اقرا یا ابـن حضـیر: بخوێنـەوە كوڕی حوضـەیر). دەڵێ: جا چومـە لای یـەحیا كەلەهەسـپەكەوە نزیـك بـو، ترسام كە پێی لێنێ. وەك سێبەرێكم دیت كەچراشێوەی تێدابو، بەئاسمانیدا هەڵكشان تا لەچاو ون بون، جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: "تلك الملائكـة كـانت تستمع لك. ولو قرأت لاصبحت یراها الناس ما تستتر منـهم: ئەوانـە فریشـتە بـون گوێیـان بـۆ رادێـرا بـوی، ئەگـەر بـەردەوام بـای بـەیانت دەكـردەوەو خـەلك فریشتەكانیان دەدیت و لێیان بزر نەدەبون" رواه البخاري ومسلم.

## سڵاوی موسوڵمانان بە پێغەمبەر ﷺ دەگەیەنن:

ئیمام ئەحمەد و نەسائی لەعەبدوڵلای كـوڕی مەسـعودەوە دەگێڕنـەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "ان لله ملائكة سیاحین یبلغوني عن امـتي السـلام: خـودا فریشتەی گەشتیاروگەڕۆكی هەن، سڵاوی ئوممەتەكەم بەمن دەگەیەنن".

لە (المعجم الكبیر)ی طەبەرانیدا بەسەنەدێكی چاك لەعەمماری یاسرەوە هاتوە، كەپێغەمبەر ﷺ فەرموی: "ان لله تعالی ملكا اعطاه سمع العباد. فلیس مـن احد یصلي علي الا بلغنیها. واني سألت ربي أن لایصلي علي عبد صلاة الا صلی علیـه عشر امثالهـا: خودای بەرز فریشتەیەكی هەیـە بیستنی بەندەكانی داوەتـێ، هەركەسێك درودێكم لەسەر لێ بدا پێمی ڕادەگەیەنێ، منیش لەپـەروەردگاری خۆم پاڕایمەوە هەر كەسێكی یەكجار درودم بۆ بنێرێ، بەهۆی ئەوە خـوای گەورە دە درودی هاوشێوەی پێشكەش بكا".

## مزگێنی دانیان بەبڕواداران:

فریشتەکان مـوژدەی ئـەوەیان بـەئیبراهیم ﷺ دا کـەخوای گـەورە منداڵێکی صاڵحی دەداتیٚ ﴿ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ، إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ سَلَامٌ قَوْمٌ مُنكَرُونَ، فَرَاغَ إِلَى أَهْلِهِ فَجَاءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ، فَقَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ، فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لَا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ : ئایا هەواڵی میوانە بەرێزەکانی ئیبراهیمت ﷺ پیٚگەیشتوە، ئەو دەمەی چونە لای و پێیان گوت: سەلام، ئەویش گوتی: سەلام، کەسانێکی نەناسراون لەلای من. جا بەنـهێنی چۆوە لای خاوخێزانەکەی و گۆلکێکی قەڵەوی بەبرژاوی بۆ هێنان. جا لەنزیکەوە بۆی دانان و گوتی: ئەدی ناخۆن؟ جا لەدڵدا ترسا، مەترسیٚ ئێمە رەوانەکراوی خودای تۆین و بەکوڕێکی زانا مزگێنیان پێدا﴾سورة الذاريات ٢٤-٢٨.

هەروەها موژدی بونی یەحیاشیان بەزەکەریا دا ﴿ فَنَادَتْهُ الْمَلَائِكَةُ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي فِي الْمِحْرَابِ أَنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَى . . : کاتێك زەکەریا لەمیحرابدا ڕاوەستابو دوعاو نوێژی دەکرد، پێیان گوت؛ خودا موژدەت دەداتیٚ بەیەحیا ﴾ سورة آل عمران/٣٩.

ئەو موژدەپێدانەش تەنها لەسەر پێغەمبەران کورت نەوەستاوە، بەڵکو ڕەنگە موژدە بەبڕوادارانیش بدەن. لەصەحیحی موسلیمیش دا لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە، لەپێغەمبەرەوە ﷺ فەرموی: "زار رجل اخا له في قرية اخرى. فأرصد الله له على مدرجته (طريقة) ملكاً. فلما أتى عليه. قال: اين تريد ؟قال: اريد اخاً لي في هذه القرية. قال: هل لك عليه من نعمة تربها؟ قال: لا. غير اني احببته في الله عزوجل. قال: فاني رسول الله اليك بان الله قد احبك كما احببته فيه: پیاوێك

سەردانی برایەکی خۆی کرد لەگوندێکی دی. خودا فریشتەیەکی هەناردە سەرڕێی. کەگەیشتە لای. پێی گوت: کێوە دەچی؟ گوتی: دەچمە لای برایەکم لەو گوندەیدا. فریشتەکە گوتی: هیچ بەرژەوەندیەکت لەگەڵیدا هەیە؟گوتی: نەخێر، جگە لەوەی کەلەبەر خودای بەرزو بەدەسەڵات خۆشم دەوێ. فریشتەکە گوتی: جا من نێردراوی خودام بۆ تۆ تا پێت بڵێم خودا تۆی خۆشویست هەروەك تۆ لەبەرخودا ئەوت خۆشویستوە".

دیسان لەصەحیحی موسلیم دایە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: "أتاني جبريل. فقال: يارسول الله! هذه خديجة قد اتتك معها اناء فيه ادام أو طعام أوشراب. فاذا هي قد اتتك. فاقرأ عليها السلام. من ربها ومني. وبشرها ببيت في الجنة من قصب. لاصخب فيها ولانصب: جیبریل هاتە لام و پێی گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا!ئەمە خەدیجەیە هاتۆتە لات و دەفرێکی پێیە پێخۆر یان خۆراك یان خواردنەوەی تێدایە. جا ئەگەر هاتەلات، سڵاوی پەروەردگاری و سڵاوی منی پێ بگەیەنەو مزگێنی بدێ بەخانوێکی لەدوڕ دروستکراوی بەیاقوت رازاوە لەبەهەشتدا نەدەنگەدەنگی تێدایە نە ماندیبون" (صحيح الجامع ١/٧٦).

## فریشتەکان و خەون دیتن:

بوخاری لەصەحیحەکەیدا لەدەروازەی شەوپەرستی، لەعەبدوڵلای عومەرﷺ، دەڵێ: (کەپێغەمبەر ﷺ لەژیاندا بو هەر پیاوێك خەونێکی دیتبا بۆ پێغەمبەر ﷺ ی دەگێڕاوە. ئاواتەخواز بوم منیش خەونێك ببینم و بۆ پێغەمبەر ﷺ ی بگێڕمەوە. ئەو کاتە جەوانێکی جحێل بوم، لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ لەمزگەوتێ دەنوستم. لەخەوێدا دیتم کەدو فریشتە گرتمیان و بۆ دۆزەخیان بردم، دیتم وەکو بیرێك هەڵپێچرابو، دو شاخیشی هەبو. خەڵکانێکی تێدا بو کەدەمناسین. دەستم پێ کرد دەمگوت: خۆم بەخودا پەنا

دەگرم لەئاگری دۆزەخ، دەڵێ: جا گەیشتینە فریشتەیەکی تر و پێی گوتم: مەترسە.

هــەروەها لەصــەحیحی بوخــاریدا، لەعائیشــەوە(رضي الله عنها)، دەڵــێ: پێغەمبەرﷺ پێی فەرموم: "أريتك في المنام يجيء بك الملك في سرقة من حرير. فقال لي: هذه امرأتك فكشفت عن وجهك الثوب. فاذا انت هي. فقلت: ان يك هذا من الله يتمــه: لەخەونێدا ئەتۆم دیت فریشــتەیەك تــۆی هێنــابو لــەناو پارچەیــەکی ئاوریشمیندا، جا پێی گوتم: ئەمە ژنەکەتە. پۆشاکەکەم لەڕوت هەڵداوە. هەر تــۆ بــەخۆت بــوی، جــا گــوتم: ئەگــەر ئەمــە لــەخوداوە بــێ تــەواوی‌دەکاو دەیگەیەنێتە سەر".

## لە پاڵ بڕواداران دەجەنگێن و لەشەڕێدا جێگیرو پتەویان دەکەن:

لەغــەزای بــەدردا خــودای گــەورە ئیمــاندارانی بەفریشــتە گــەلێکی زۆر کۆمەك کرد ﴿ اذ تستغيثون ربكم فاستجاب لكم اني ممدكم بالف من الملائكة مردفين: زەمــانێك کۆمــەکتان لەپــەروەردگارتان داوادەکــرد، جــا وەڵامــی ئێــوەی داوەو فــەرموی: بەڕاســتی مــن بەهــەزار فریشــتە کەبەدواییــەکدا دێنــەخوارێ پشتگیریتان دەکەم ﴾ سورة الانفال/٩.

﴿ ولقد نصركم الله ببدر وانتم اذلة فاتقوا الله لعلكم تشكرون. اذ تقول للمؤمنين الن يكفيكم ان يمدكم ربكم بثلاثة آلاف من الملائكة منزلين. بلى ان تصبروا وتتقوا ويأتوكم من فورهم هذا يمددكم ربكم بخمسة آلاف من الملائكة مسومين: وەخــوا لەشەڕی بەدردا یارمەتیدان، لەحاڵێکدا ئێوە ناتەوان و زەبون بون، جا لەبەر ئەمە لەخودا بترسێن تا شوکری خودا بەجێ بێنن. لەودەمیدا بەبڕوادارانت دەگوت: ئایا بەس نیە کەپــەروەردگارتان بەســێ هــەزار فریشــتەی نــێردراو

یارمەتیتان دەدا. بەڵێ ئەمڕۆش ئەگەر ئارامتان هەبێ‌و خۆپارێزبن و دوژمن بەزوویی بێتە سەرتان، خودا یارمەتیتان دەدا بە پێنج هەزار فریشتەی نیشانەدار ﴾ سورة آل عمران/١٢٣-١٢٥.

هەروەها ﷺ لەرۆژی بەدردا فەرموی: "هذا جبريل آخذ برأس فرسه. عليه أداة الحرب: ئەمە جیبریلە سەری هەسپەکەی گرتوەو، ئامرازی شەڕی لەبەرە " (رواه البخاري).

جا خودا حیکمەت و مەبەستی لەم کۆمەکی‌کردن وەهانا هاتنە، جێگیرو پێگیرکردنی ئیمانداران و جەنگین بو لەپاڵیان بۆ شەڕی دوژمنانی خواو لێدانی گەردن و دەستەکانیان: ﴿ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلاَّ بُشْرَى وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ: خودا ئەمەی تەنها بۆ شادی وئارامی دڵو دەرونی ئێوە داناوە، دیارە سەرکەوتن تەنیا بەدەست خودایە. بەڕاستی خودا تواناو دانایە ﴾ سورة الانفال/١٠.

﴿ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ: کاتێك پەروەردگارت سروشی بۆ فریشتە نارد، بەڕاستی من لەگەڵ ئێوەم، جا ئەو کەسانە پتەوکەن کەبڕوایان هێناوە، ئێمە ترس و تۆقین دەخەینە ناو هەناوی کافران و بێ بڕوایان، جابەتوندی لەتەوقی سەریان دەن و هەمو پەنجەکانیان وردبکەن ﴾ سورة الانفال/١٢. لەسورەتی (آل عمران)یشدا دەفەرمێ: ﴿ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلاَّ بُشْرَى لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُمْ بِهِ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ، لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِنْ الَّذِينَ كَفَرُوا أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنْقَلِبُوا خَائِبِينَ: وەخودا ئەمەی نەکرد مەگەر

مزگێنیەك بێ بۆ ئێوەو دڵتان ئارامی پێ بگرێ، سەركەوتنیش هەرلەلای خودای تەواناو خاوەن حیكمەتە. ئەم پشتیوانییە تابەشێكی بێ بڕوایان لەناو ببا، یان بیانشكێنی هەتاكو بەنائومێدی و سەرشۆڕی بگەڕێنەوە ﴾ سورة آل عمران/١٢٦-١٢٧.

پێغەمبەریش ﷺ لەڕۆژی بەدردا فریشتەی دیتن، هەروەك لەصەحیحی بوخاریدا هاتوە، كەپێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی بەدردا لەگەڵ ئەبوبەكر ﷺ لەژێر كەپرێدا بو، دوعایان دەكردو لەخوا دەپاڕانەوە، لەو كاتەدا پێغەمبەر ﷺ كەمێك بۆرژا، پاشان بەلێوی بەخەندەوە هەستاو، فەرموی: (أبشر یا ابابكر هذا جبریل علی ثنایاه النقـــع: مزگێنی بێ ئەبوبەكر ئەوە جیبریلەو تۆزو گەردی شەڕی لێنیشتوە)، یەكێك لە جەنگاوەرە موسوڵمانەكانیش گوێی لە دەنگی لێدانی فریشتەیەك بو بۆ یەكێك لەكافران، هەروەها گوێی لەدەنگی بو كەئەسپەكەی تاودەدا.

لەصەحیحی موسلیمدا لەئیبنیعەبباسەوە هاتوە: (كاتێك پیاوێكی موسوڵمان بەتوندی بەشون پیاوێك لەموشریكان كەوتبو ڕاوی دەنا، گوێی لەلێدانی قامچییەك بو لەسەرەوە ڕا، دەنگی سوارەكەشی ژنەوت كەدەیگوت بەپێش كەوە (حەیزوم)، كەئاوڕی لەكابرای موشریك داوە دیتی كەوتۆتە گۆڕێ، دەڵێ: تەماشای كرد سەرو ڕوی تێكشكاوەو هەڵزراوە، وەكو ئەوەی بەقامچییەك لێی درابێ، هەموشی كەسك هەڵگەڕابو. ئەوجا ئەنصاریەكە هاتەلای پێغەمبەرﷺ و بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "صدقت ذلـــك من مدد السماء الثالثة: ڕاست دەكەی، ئەوە لەكۆمەكی ئاسمانی سێیەمە".

هەروەها فریشتە لەجێی دیكەش شەڕیان كردوە، لەغەزای خەندەقدا خوای گەورە فریشتەی خۆی هەناردن ﴿ یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَیْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَیْهِمْ رِیحًا وَجُنُودًا لَمْ تَرَوْهَا: ئەی كەسانێكی

کەبڕواتان هێناوە، بێتەوە بیرتان ئەو نیعمەتەی خودا بەئێوەی بەخشیوە. لەودەمەی لەشکری گەورە هاتە سەرتان، ئێمە باوتۆف ولەشکرێکی زۆرمان ناردەسەریان کەئێوە نەتان دەدیت ﴾ سورة الاحزاب/٩.

دیارە مەبەست بەسەربازە نەدیتراوەکانیش فریشتەکانن، هەروەك لەصەحیحەکان ولەغەیری وانیشدا هاتوە کەجیبریل پاش هاتنەوە لەغەزای ئەحزاب هاتەلای پێغەمبەر ﷺ وتۆزو غوباری پێوەبو. لەوکاتیش پێغەمبەر ﷺ خۆی دەشوشت. جیبریل بەپێغەمبەر ﷺ فەرمو: "أوضعتم سلاحكم. فانـا لم نضع سلاحنا بعد. فقال: الى اين ؟فاشار الى بني قريظـة: ئێوە چەکی خۆتان دانا، بەلاّم هێشتا ئێمە چەکی خۆمان دانەناوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بۆ کوێ؟ جیبریل ئاماژەی بۆ بەنی قورەیظە کرد".

## پاراستنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ :

موسلیم لەصەحیحەکەیدا لەئەبوهورەیرە ﷺ دەگێرتەوە کەدەڵێ: (ئەبوجەهل گوتی: ئایا موحەممەد لەنێو ئێوەدا ڕوی خۆی لەخۆڵێ وەردەدا، دەڵێ: گوتیان بەڵێ. جا ئەبوجەهل گوتی: سوێند بەلات و عوززا ئەگەر ببینم ئەوەی بکا، پێ لەسەرملی دادەنێم یا تەواو ڕوی لەخۆڵێ وەردەدەم دەڵێ: جا هاتە لای پێغەمبەر ﷺ کەنوێژی دەکرد، گوایە دەیویست بچێتە سەر ملی. دەڵێ: هەر هێندەیان زانی پشتاوپشت دەگەڕێتەوەو بەدەستەکانی خۆی دەپارێزێ. دەڵێ: پێیان گوت: چیت لێ قەوماوە، گوتی: لەنێوان من و ئەودا کەندەکێکی ئاگرو ترس و تۆقین و، کۆمەڵە باڵێك هەیە). جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "لو دنا مني لاختطفته الملائكة عضواً عضواً: ئەگەر لێم نزیك بایەوە فریشتەکان پەل پەل ڕایاندەفڕاند".

## پاراستن و سەرخستنیان بۆ بەندەچاکەکان وهاتنەهانایان:

ڕەنگە خوای گەورە فریشتان بنێریٚ بۆ پاراستنی هەندێك لەبەندە صاڵحەکانی خۆی جگەلە پێغەمبەران. دەشبێ ئەمە لەگەڵ ئەو پیاوەدا روی دابێ کەئیبنی‌کەثیر هەواڵەکەی باس دەکا. هەروەك لەتەفسیرەکەیدا هاتوە بۆ ئەو ئایەتەی دەفەرمێ: ﴿ أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضطَرَّ إِذَا دَعَاهُ : یا کێ وەلامی ناچاران دەداتەوەو وەهانایان دێ کەلێی بپاڕێتەوە ﴾ سورة النمل/٦٢.

ئیبنی‌عەساکیری حافیز لەژیاننامەی پیاوێکدا کە ئەبوبەکر موحەممەدی کوڕی داودی دینەوەری ناسراو بە (الدقي الصوفي) لێی دەگێڕتەوە، هێناویە، ئەو پیاوە دەڵێ: هێسترێکم هەبو کرێباریم پێدەکرد لەنێوان شاری دیمەشق و دەڤەری (البداني). جارێکیان کابرایەکم لەگەڵ سوار بو، لەبەشێکی ڕێیەکەدا لاڕێ بوین و بەجێیەکی داچوین کەسی پێ دانەچو بو، پێی گوتم: بێرەدا هەڕو نێزیکترە، گوتم: ئەمن تێیدا شارەزا نیم، ئەو گوتی: بەڵێ، ئەمە نزیکترە، ڕێگاکەمان گرتەبەر، توشی کەندو لەندێکی بوین و، دۆڵێکی قوڵمان هاتە پێش کوژراوێکی زۆری لێ بو، پێمی گوت: سەری هێسترەکەی بگرە تا دادەبەزم، جادابەزی و خۆی هەڵمالی‌و جلەکانی خۆی خڕکردەوەو چەقۆیەکی هەڵکێشاو بەرەو ڕوم هات، لەنێو دەستانی هەلاتم و ئەو بەدوم کەوت. لێی پاڕامەوەو پێم گوت: هێسترەکەی بەبارەوە ببە، گوتی: ئەوە هەر بۆ خۆمە. بەلام دەمەوێ بتکوژم، لەخوداو سزاو تۆڵەی خوام ترساند گوێی نەدامێ. ناچار خۆم دا بەدەستیەوەو پێم گوت: دەمەوێ لێم گەڕێی تادو ڕکاتە نوێژان دەکەم، گوتی: زوبە، جا هەستام نوێژێ بکەم، قورئانم لێ تێکەڵ بو، تەنانەت پیتێکم وەبیر نەهاتەوە. هەر بەسەر گەردانی ڕاوەستا بوم و، ئەویش دەیگوت: دەی تەواوبە، جا خوای گەورە ئەو ئایەتە پیرۆزەی هێنا سەر زارم: ( أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ) هێندەم

زانی وا سوارێك لەدەرگەی دۆڵەکەڕا دێ و نێزەیەکی بەدەستەوەیە. نێزەکەی لەکابرای گرت و ڕێك لەدڵی چەقی، خۆم بەسوارەکەی شۆڕکردەوەو گوتم: توخوا تۆ کێی؟ گوتی: ئەمن نێردراوی ئەو کەسەم وەهانای ناچاران دێ، کەلێی دەپاڕێنەوەو خراپەش لادەبا.

دەڵێ: ئەوجا هێسترو بارەکەم هێناوەو بەسەلامەتی گەڕامەوە. هەروەها خوای گەورە جیبریلی نارده فریای دایکی ئیسماعیل لەمەککە. هەروەك لەصەحیحی بوخاریدا هاتوە لەئیبنیعەبباسەوە، لەچیرۆکی کۆچ کردنی ئیبراهیم بە ئیسماعیلی کوڕی و هاجەری دایکی ئیسماعیل بۆ خاکی مەککە-ئەمەش چیرۆکێکی درێژە-کەدایکی ئیسماعیل وەك مرۆڤێکی ماندو لەنێوان صەفاو مەروە هەفت جاران هاتو چو، لەدوای ئاوێ دەگەڕا، کەگەیشتە سەر مەروە گوێی لەدەنگێك بو. گوتی: وس بە، مەبەستی خۆی بو، پاشان گوێی ڕاگرت دیسان گوێی لێ بو. گوتی: واگوێم لێتە ئەگەر یارمەتیەکت پێیە. جا فریشتەکەی لەشوێنی زەمزەم بینی، کەبەپاشپانی، یا گۆتی بەباڵی لەزەوی دەگەڕا تا ئاوی دۆزیەوە فریشتەکە پێی گوت: (لەبزربونێ مەترسێ چونکە ماڵێکی خوا لێرەدایە ئەو کوڕەو باوکی بنیاتی دەنێن، خوداش خودایی‌یان بزرناکا).

هەروەها لەسونەنی نەسائی بەسەنەدێکی صەحیح هاتوە کەئەو فریشتەیەی هاتۆتەلای جیبریل بو "ان جبريل لما ركض زمزم بعقبه جعلت ام اسماعيل تجمع البطحاء. رحم الله هاجر لو تركتها كانت عينا معينا: کەجیبریل بەپاشپانی خۆی زەمزەمی هەڵکۆلی، دایکی ئیسماعیل بەردی لەدەور خڕدەکردەوە، ڕەحمەتی خودا لەهاجەر بێ ئەگەر وازی لێ هێنابا زەمزەم دەبوە چاوگێکی زۆر ئاودار " (صحيح الجامع ١٩٧/٢).

## ئامادەبونی فریشتان لەناشتنی صالحان:

**پێغەمبەر ﷺ لەبارەی سەعدی کوڕی موعاذ فەرمویەتی:** (هذا الذي تحرك له العرش وفتحت له ابواب السماء. وشهده سبعون الفاً من الملائكة. لقد ضم ضمة. ثم فرج عنه: **ئەمە ئەوەیە کە عەرشی بۆ جوڵاو دەرگەکانی ئاسمانێی بۆ کراوەو، هەفتا هەزار فریشتە ئامادەی ناشتنی بون، زەوی جارێکی گوشی و گوڕەوشاریدا، پاشان بەریدا** ) رواه النسائي عن ابن عمر باسناد صحيح (صحيح الجامع ٦/٧٢).

## سێبەرکردنیان لەشەهیدان بەباڵەکانیان:

**لەصەحیحی بوخاریدا، لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاﷺ وەهاتوە دەڵێ: کە بابم کوژرا هەر سەریم هەڵدەداوەو دەگریام، پێیان دەگوتم: وامەکە، بەلاّم پێغەمبەر ﷺ: نای لێ نەدەکردم، فاطیمەی پلکیشم دەستی بەگریان کرد. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمو:** (تبكين اولاتبكين. مازالت الملائكة تظله باجنحتها حتى رفعتموه: **بگری یان نەگری، فریشتەکان هەر بەباڵەکانیان سێبەریان لێ دەکرد هەتا بەرزتان کردەوە).**

**بوخاری لەسەر دێری ئەم فەرمودەیە نوسیویە: (دەروازەی، سێبەری فریشتان لەسەر شەهید) .**

## ئەو فریشتانەی تابوتەکەیان هێنا:

**خودای گەورە دەفەرمێ:** ﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلَائِكَةُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ: **وەپێغەمبەری ئەوان پێی گوتن؛ بەڕاستی نیشانەی**

حوکومەتی (طالوت) ئەوەیەکە تابوتی عەهدو پەیمانتان بۆ دێ کە هۆی دلنیایی ئێوەی لەلایەن پەروەردگارتانەوە تێدایەو، هەندێك میراتی خانەدانی موساو هارونە کەفریشتەکان هەڵیان گرتوە ﴾ سورة البقرة/٢٤٨.

ئەوەی لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەیوەندی بەئێمەوە هەیە ئەوەیە کەخودا هەواڵی پێداوین. فریشتەکان لەو سەردەمدا تابوتێکیان بۆ ئیسرائیلیەکان هێنا. وەکو دڵارام کردن و جێگیرکردنیان، تابزانن کە طالوت لەلایەن خواوە هەڵبژێردراوەو ئەوجا شوێنی بکەون و گوێڕایەڵی بکەن.

## پاسکردنی مەککەو مەدینە لەدەجال لەلایەن فریشتانەوە:

کاتێك دەجال وەدەردەکەوێ، لەمەککەو مەدینە بترازێ، دەچێتە هەمو شارو شوێنێك. چونکە فریشتەکان ئەم دوشارە دەپارێزن. هەروەك لەصەحیحی موسلیم و سونەنی ئەبوداودو تیرمیذیدا هاتوە. لەفەرمودەی فاطیمەی کچی قەیس، لەچیرۆکەکەی تەمیمی داریەوە، کەدەجال گوتی: (من مەسیحی دەجالم، هێندەم نەماوە ئیزنی هاتنە دەرەوەم پێ بدرێ، دێمە دەرێ وبەزەویدا دەگەڕێم، لەچل شەواندا چ ئاواییەك نایەڵم لێ دانەبەزم. جگەلە مەککەو طیبە، چونکە ئەوانە هەردوك لەمن حەڕامن، هەرکاتەکی بمەوێ لەیەکێکیان بچمە ژورێ، یا بچمە ناو یەکێك لەوانە. فریشتەیەك بەرەو ڕوم دێ شمشێرەکی هەڵکێشراوی لەدەستی دایە لێ ناگەڕێ بچمە ژورێ و ڕێم لێ دەگرێ و، لەسەر هەر دیوارێکی فریشتەیەك هەیە پارێزگاری لێ دەکا، دەڵێ پێغەمبەر ﷺ داردەستەکەی لەمینبەرەکە چەقاند و فەرموی: (هذه طیبة. هذه طیبة. هذه طیبة: ئەمە طیبەیە)، واتە: مەدینە، طیبەیە. بوخاریش لە ئەبوبەکر دەگێڕتەوە لەپێغەمبەر ﷺ فەرموی: "لایدخل المدینة رعب المسیح الدجال. لها یومئذ سبعة ابواب. علی کل باب ملکان: تۆقاندن و

**ترسی مەسیحی دەجال ناچێتە مەدینەوە. لەو کاتی مەدینە هەفت دەرگەی هەیە لەسەر هەر دەرگەکی دو فریشتە هەن".**

**هەروەها لەصەحیحی بوخاریدا لەئەبوهورەیرەوەﷺ هاتوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرموی:** "علی انقاب المدینة ملائکة. لایدخلها الطاعون ولا الدجال: **فریشتە لەسەر دیوارەکانی مەدینە هەن، نەتاعونی دەچێتە ناو نەدەجال".**
**هەر لەبوخاریدا:** (لیس من بلد الاسیطؤه الدجال. الا مکة ومدینة. لیس لها من نقابها نقب الا علیه الملائکة صافین یحرسوها. ثم ترجف المدینة باهلها ثلاث رجفات فیخرج الله کل کافر ومنافق: **هەمو شارو وڵاتێك دەجالی دەچێ. جگەلە مەککەو مەدینە، هیچ شورەو دیوارێکی نیە کەفریشتەی لەسەر نەبێ، بەرێز راوەستاون و دەیپارێزن. پاشان مەدینە سێ جاران بەخەڵکەکەی دەلەرزێ. ئەوجا هەرچی بێ بڕواو دەغەڵە خودا دەیکاتە دەرەوە).**

## دابەزینی عیسا بەهاوەڵێتی دو فریشتان:

**لەدوایی زەمان دا، عیسای کوڕی مەریەم لەلای منارەی سپی لە خۆرهەڵاتی دیمەشق دادەبەزێ، لەنێو دو پۆشاکی ڕەنگ کراو بەویرس و بەزەعفەران. ناو لەپەکانی لەسەر باڵی دو فریشتان داناوە.** (رواه مسلم في صحيحه والترمذي في سننه) .

## فریشتەکان باڵیان بەسەر شامدا هەڵخستوە:

**لەزەیدی کوڕی ثابیتی ئەنصاریﷺ، دەڵێ: گوێم لێ بو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو:** (یا طوبی للشام یاطوبی للشام: **شادی بۆشام، شادی بۆ شام).**

**گوتیان ئەمە بەچی ئەی پێغەمبەری خوا؟فەرموی:** (تلك ملائکة الله باسطو اجنحتها علی الشام: **ئەوانە فریشتە گەلێکن باڵی خۆیان بەسەر شامدا راخستوە)، شێخ ناصر لەتەخریجی فەرمودەکانی (فضائل الشام)ی**

**(الربعي)دا لەبابەت ئەم فەرمودەیە دەڵێ**: (هو حديث صحيح اخرجه الترمذي والحاكم في المستدرك واحمد في المسند، وقال الحاكم: صحيح على شرط الشيخين وافقه الذهبي وهو كما قالا. وقال المنذري في الترغيب والتذهيب. ورواه ابن حبان في صحيحه والطبراني باسناد صحيح) .

## پاداشی ڕێکەوتن لەگەڵ فریشتان:

**لەهەردو صەحیحاندا هاتوە، کەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی**: "اذا امّن الامام فأمنوا فان من وافق تأمينه تامين الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه: **ئەگەر ئیمام گوتی ئامین ئێوەش بیڵێن. چونکە ئامین گوتنی هەریەکێك لەگەڵ هی فریشتان ڕێککەوت، خوا لەگوناهەکانی پێشینی خۆش دەبێ**".

**لەصەحیحی بوخاریشدا هاتوە**: (اذا قال الامام آمين فان الملائكة تقول في السماء آمين فمن وافق تأمين تأمين الملائكة غفر له ماتقدم من ذنبه: **ئەگەر ئیمام گوتی ئامین، فریشتەکانیش لەئاسمانێدا، دەڵێن ئامین. جا هەرکەسێکی ئامین گوتنەکەی لەگەل هی فریشتان ڕێککەوت. خوا لەگوناهەکانی پێشوی دەبوری**).

**هەروەها لەصەحیحی بوخاریدا لەئەبوهورەیرەوەﷺ، کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی**: "اذ قال الامام سمع الله لمن حمده. فقولوا: اللهم ربنا ولك الحمد. فان من وافق قوله قول الملائكة غفر له ماتقدم من ذنبه: **کەئیمام گوتی** (سمع الله لمن حمده)، **ئێوەش بڵێن**: (اللهم ربنا ولك الحمد)، **گۆتنی هەر یەکێك لەگەل هی فریشتان تێك بکاتەوە خودا لەگوناهەکانی پێشوتری خۆش دەبێ** "(ورواه بقية الجماعة الا ابن ماجة).

## ئەرکی بڕوادار لەئاست فریشتان:

**فریشتەکان بەندەی خودان و هەڵبژاردون و پلەو پایەیەکیان لەلای پەروەردگاریان هەیە. ئەو ئیماندارەی خوا دەپەرستێ و شوێن ڕەزامەندی**

وی دەکەوێ چاری نیە، دەبێ فریشتەکانی خۆش بوێو رێزیان لێ بگرێ. ئەو ئیشانە نەکا کەپێیان ناخۆشەو ئازاریان دەدا. لەو باسەی دادێ زێتر ئەو مەسەلەیە ڕون دەکەینەوە.

### دورکەوتنەوە لەگوناه و تاوانان:

گوناه و تاوان و، بێبڕوایی و هاوبەش دانان، زێترین ئازار بەفریشتان دەگەیەنن، بۆیە چاکترین دیاری کەفریشتان رازی کا، دلڕاستی مرۆیە لەئاینی پەروەردگاری، لەگەڵ دورکەوتنەوەو وەلاکەوتن لەو کردارانەی خوا توڕەدەکەن. هەر بۆیەشە فریشتەکان ناچنە ئەو شوێن و مالانەی کەتاوان و یاخیبونیان لەخوای بەرز تێدا ئەنجام دەدرێ، یان شتێکیان تێدایە خوای گەورە ڕقی لێیەو دەیبوغزێنێ، وەکو بت و پەیکەر و وێنە. هەروەها لەکەسێك نێزیك نابنەوە کەخۆی لەتاوان و گوناهێك هەڵکێشابێ وەکو مەی نۆش و سەرخۆشان.

ئیبنی کەثیر دەڵێ: (البدایة ١/٥٥) لەفەرمودەیەك دا هاتوە کەلەصەحیحەکان و موسنەدو سونەنەکان دا گێڕدراوەتەوە لەفەرمودەی کۆمەڵە هاوەڵێك لەپێغەمبەری خواوە ﷺ کەفەرمویەتی: "لایدخل الملائكة بيتاً فيه صورة ولا كلب ولاجنب: فریشتە ناچنە ماڵێکی وێنەیەك یا سەگێك یا لەشپیسەکی تێدا بێ"[٢].

لەریوایەتێکیش کەلە عاصیمی کوڕی ضەمرە لەعەلیەوە هاتوە (ولا بول) یان میزی تێدابی، لەڕیوایەتی رافیعیش لە ئەبوسەعیدەوە بەمەرفوعی (لاتدخل الملائكة بيتاً فيه كلب او تمثال: فریشتە ناچنە ماڵێکی سەگێك یا پەیکەرێکی تێدابێ).

لەریوایەتێکی ذەکوان ئەبوصالحی سەممان ﷺ، لەئەبوهورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لاتصحب الملائكة رفقة معهم كلب او جرس) واتە: فریشتەکان هاوەڵێتی پێڕێك ناکەن سەگێك یا زەنگێکیان لەگەڵ دابێ.

(البزار) بەسەنەدێکی صەحیح لەبورەیدە ﷺ دەگێڕیتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (ثلاثة لاتقربهم الملائكة: السكران. والمتضمخ بالزعفران. والجنب: سێ کەسن فریشتە لێیان نێزیك نابنەوە، لەسەرخۆش و لەوەی خۆی لەزەعفەران وەرداوەو لەوەی لەشپیسە ) (صحيح الجامع ٣/٧٠).

لەسونەنی ئەبوداودیش بەسەنەدێکی چاك لەعەممباری یاسرەوە ﷺ لەپێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە: "ثلاثة لا تقربهم الملائكة: جيفة الكافر. والمتضمح بالخلوق. والجنب الا ان يتوضأ: سێ کەسن فریشتە لێیان نێزیك نابنەوە: کەلاکی بێبڕوا، وە ئەو کەسەی خۆی لەبۆنێکی زەعفەرانی وەرداو، ئەوی لەشی پیسە، مەگەر دەستنوێژ بشوا " (صحيح الجامع ٣/٧٠).

## فریشتەکان ئازاردەبینن لەوەی ئادەمی‌یان ئازاردەدا :

لەفەرمودە صەحیحەکاندا سەلماوە، کەئەو شتەی ئادەمیزاد ئازار بدا، فریشتانیش ئازار دەدا. جا فریشتەکان لەبۆگەنی و پیسی و پۆخڵی ئازاردەبینن. بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "من اكل الثو م والبصل والكراث فلا يقربن مسجدنا. فان الملائكة تتأذى مما يتأذى منه بنو آدم: هەرکەسێکی سیر یان پیواز یا کەوەری خوارد با لەمزگەفتەکانمان نزیك نەبتەوە، چونکە فریشتەکان ئازاردەبینن لەوەی ئادەمی‌یان ئازاردەدا".

لەصەحیحی موسلیمیشدا هاتوە، کەپێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەو کەسی کرد کەهاتبوە مزگەفتێ و بۆنی سیروپیازی لێ دەهات، بۆ بەقیع بچێتە دەرەوە.

## ناکردن لەتف کردنە لای راست لە نوێژێدا :

پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لەتف کردنە لای راستە لەکاتی نوێژدا، چونکە یەکێك هەڵدەستێ نوێژ بکا، فریشتەیەك لەلای راستیەوە

رادەوەستێ. لەصەحیحی بوخاریدا هاتوە لەئەبوهورەیرەوە ﷺ لەپێغەمبەر ﷺ، فەرموی: "اذا قام احدكم الى الصلاة فلا يبصق عن امامه فانه انما يناجي الله مادام في مصلاه: ولا عن يمينه فان عن يمينه ملكاً. وليبصق عن يساره او تحت قدمه فيدفنها: ئەگەر یەکێکتان هەستا نوێژ بکا باتف لەپێشەخۆی نەکا چونکە ئەو موناجاتی خوا دەکا تالەنوێژدابێ. باتف لەلای راستیش نەکا چونکە فریشتەیەك لەلای راستیەوەیە، باتف لەلای چەپ بکا یالەبن پێی خۆی و بیشارتەوە".

## دۆستایەتی سەرجەم فریشتەکان:

پێویستە لەسەر موسڵمان هەمو فریشتەکانی خۆش بوێ و جوایەزی لەنێوان فریشتەیەك و یەکی دی نەکات. *چونکە ئەوان هەمو بەندەی کارگەر* بەفەرمانی خودان و وازیان لەنەهی یەکانی هاوردوە و، لەمەشدا هەمویان تێکرا یەك یەکەن و جوداو پەرتەوازەنین. جولەکەکان وایان دانابو دۆست و دوژمنیان لەنێو فریشتان داهەیە. جا جیبریلیان بەدوژمنی خۆ دانابو، میکائیلیش بەدۆست، بەڵام خودای بەرز لەو بانگەشەیە بەدرۆی خستنەوە و رایگەیاند فریشتەکان لەنێو خۆدا جیاڕانین. جا هەریەکێك دوژمنی خودا یان یەکێك لەفریشتان بێ، ئەو کەسە دوژمنی سەرجەم فریشتانە ﴿قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ، مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ، وَلَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا الْفَاسِقُونَ: بڵێ هەرکەسێك دوژمنی جیبریل بێ بابزانێ دوژمنی خوایە، چونکە ئەو بەفەرمانی قورئانی دابەزاندە ناو دڵ ودەرونی تۆ، قورئانێك کەکتێبە پێشینەکانی بەردەسی ئێوەی بەڕاست

داناوەو مایەی رێنوینی و مژدەو مزگێنیە بۆ بڕواداران. کەسێ کەدوژمنی خوداو فریشتەکان و پێغەمبەرانی ئەو و دوژمنی جیبریل ومیکال بێ بێبڕوایەو خوداش دوژمنی بێبڕوایانە ﴾ سورة البقرة/٩٧-٩٨.

جا لێرەدا خوای گەورەو بێخەوش هەواڵی پێداوین، کەفریشتەکان هەمو یەکە یەکی یەکگرتون، جاهەرکەسێك دژاتی یەکێکیان بکا، ئەوا دژایەتی خوداو هەمو فریشتانیش دەکا. هەرچی دۆستایەتی کردنی هەندێك فریشتان و دژایەتی هەندێکی دیکەشە، ئەوە پڕو پوچی و ئەفسانەیەکە جگە لەو بیرە جولەکانە وێل ولاڕێیە کەس قوتی نادا. ئەم گۆتەیەش کەقورئان لەجولەکەکانەوە دەیگێڕتەوە، لەبیانوێکی پوچ بەدەر نیە کەکردبویانە هەنجەتی باوەڕ نەهێنانیان. جا دەیانگوت کەجیبریل دوژمنیانە چونکە شەڕویرانکاری دەهێنێ و، گوایە ئەگەر میکائیل بابهاتبا لای پێغەمبەر ﷺ، ئەوان شوێنی دەکەوتن.

باشترە بگەڕێیەوە بۆ هۆکانی دابەزینی ئەم ئایەتە لەڕاڤەی ئیبنیکەثیر و شوێنی دیکە.

## فریشتەکان و بێبڕواو لاڕێیان:

پێشتر هەڵوێستی فریشتانمان لەئاست ئیمانداران رونکردەوە. لەمیانەی ئەوەشدا هەڵوێستیان لەئاست کافران رون بۆوە. فریشتەکان بێ بڕواوستەمکارو تاوانبارەکانیان خۆش ناوێ، بەڵکو دژایەتیان دەکەن و لەگەڵیان بەشەڕدێن و، دڵانیان دەلەرزێنن وەکو لەغەزای بەدرو ئەحزاب دا روی دا. لێرەدا پتر درێژە بەباسەکەمان دەدەین و رونتری دەکەینەوە بەوباسانەی کەلەپێشدا لێیان نەدوابوین.

## دابەزاندنی ئازارو ئەشکە نجە بۆ کافران:

کاتێك کەیەکێك لەپێغەمبەران وەدرۆ دەخرایەوەو، قەومەکەی پێگیری یان دەکرد لەبەدرۆخستنەوەی، خودا زۆر جاران سزای دەدان و ئەشکەنجەی بۆ دادەبەزاندن. جار وادەبو فریشتەکان بەئەشکەنجەدان هەڵدەستان و ئەنجامیان دەدا.

## تەفرو توناکردنی قەومی لوط:

ئەوان فریشتانی فەرمانی سزادانی قەومی لوطیان پێ سپێردرا بو، بەوێنەی لاوی جوانچاك و چەلەنگ هاتن. جا لوط مێوانداری کردن و، قەومەکەی پێیان نەزانی، بەلاّم ژنی لوط قەومەکەی ئاگادارکرەوە، زوبەزو هاتن و مەبەستیان بو فاحیشە لەگەل میوانەکان بکەن، بەلاّم لوط داکۆکی لێ کردن و، گفتوگۆی لەگەڵ قەومەکەی کردو ئەوانیش گوێیان نەدایێ. جا جیبریل بەباڵی خۆی لێی دان و، چاوی بەقوڵدابردن کوێری‌کردن. ﴿ وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ، وَجَاءَهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِنْ قَبْلُ كَانُوا يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ قَالَ يَاقَوْمِ هَؤُلَاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِي فِي ضَيْفِي أَلَيْسَ مِنْكُمْ رَجُلٌ رَشِيدٌ، قَالُوا لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ، قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ، قَالُوا يَالُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَنْ يَصِلُوا إِلَيْكَ. .: وەکاتێك رەوانەکراوەکانی ئێمە هاتنە لای لوط، بەهاتنیان دڵتەنگ و پەرێشان بو، گوتی: ئەمڕۆ رۆژێکی سەختە. هۆزەکەی بەلەز هاتنە لای لوط و پێشتر کاری خراپیان دەکرد، گوتی: ئەی هۆزی من!ئەمانە کیژانی منن، بۆ ئێوە پاکترن گەر بڕوابێنن و بیانخوازن

**لەکاری نەشیاو خۆ بپارێزن و، لەخوا بترسێن و لەئاست میوانەکانم شەرمەزارو روزەردم مەکەن، ئایا لەنێو ئێوەدا مێرێکی تێگەیشتو و پێگەیشتو نیە. گوتیان بەراستی تۆ دەزانی ئێمە هیچ ماف و مەیلێکیشمان لەکچانی تۆ نیەو، چاك دەزانی چمان دەوێ. گوتی: ئەگەر لەبەرامبەر ئێوە هێزێك یا پشتیوانێکی توندم هەبوایە دەوزانی چم لێدەکردن. گوتیان ئەی لوط!بەراستی ئێمە رەوانکراوی پەروەردگارتین. خەڵکی بێبڕوای شار هەرگیز دەستیان ناگاتە تۆ ﴾** سورة هود/٧٧-٨١.

**ئیبنی کەثیر دەڵێ** (البداية ١/١٩٧): **(دەڵێن کەجیبریل** عليه السلام **لێیان هاتە دەرێ، بەلێواری باڵی لەڕوی دان، چاویان سڕاوەو دەڵێن هەر تەواو بەقوڵ داچو و هەر شونی نەماو جێ بزربو. خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿** وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَنْ ضَيْفِهِ فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ: **جا بێ بڕوایان لەمیوانی لوط کاری دزێویان ویست، ئێمەش چاوی ئەوانمان بەقوڵدابردو کوێروونابینامان کردن. جا بچێژن ئەشکەنجەو هەڕەشەکانم ﴾**سورة القمر /٣٧.

**لەسبەینێشدا خوای بەرز هەموی تەفروتوناکردن: ﴿**فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ مَنْضُودٍ(٨٢)مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنْ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ: **جا کاتێك فەرمانی ئێمە هات شاروديمان ژێروروکردو، بارانی گڵمەتی وەك بەردی رەقمان بەسەریاندا رژاند، گڵمەت گەڵێك کەلای پەروەردگارت نیشانداربون و، ئەوە لەستەمکارو زۆرداران دورنیە ﴾** سورة هود /٨٢-٨٣.

**ئیبنی کەثیر دەڵێ: موجاهید گوتی: (جیبریل قەومی لوطی لەناو ماڵ و سامانی خۆیاندا هەڵگرت و، بەهەمو ماڵات و کەل و پەلەوە بەرزی کردنەوە، هێندی بەرز کردنەوە تا ئاسماننشینان گوێیان لەوەڕینی سەگەکانیان بو،**

جا لەویٚ ڕاهەڵی ڕشتن، جیبریل بەپەڕی باڵی ڕاستی هەڵیگرتبون) جاگۆتەی نێزیك لەوەشی هێناوەتەوە، بەڵام فەرمودەی وای نەهێناوە ببتە بەڵگەبۆیان.

## نەفرەت کردن لەبیٚ بڕوایان:

خوای بەرز دەفەرمیٚ: ﴿ كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ، أُولَٰئِكَ جَزَاؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ: چلۆن خودا هۆزێك ڕێنوێنی دەکا. کەدوای بڕواهێنان و شایەدی دانیان بەهەقانیەتی پێغەمبەر ﷺ وهاتنی نیشانەگەلێکی ڕون بۆیان، کافربون، خودا دەستەی ستەم کاران ڕێنوێنی ناکا، ئەوانە سزایان ئەوەیە کە بەڕاستی نەفرەتی خوداو فریشتەو هەمو خەڵکیان لەسەرە ﴾ سورة آل عمران/٨٦-٨٧.

هەروا دەفەرمیٚ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ: بەڕاستی کەسانێکی کافرو بیٚ بڕوابون و هەر بەکافریش مردن. ئەوانە نەفرەتی خوداو فریشتەکان و تێکڕای خەڵکیان دەچێتە سەر ﴾ سورة البقرة/١٦١.

جا فریشتە بەتەنیٚ نەفرەت لەبێبڕوایان ناکەن، بەڵکو ڕەنگە نەفرەت لەوانەش بکەن کەهەندێك جۆرە گوناهی دیاریکراو دەکەن، لەوانەش:

## نەفرەتی فریشتان لەو ژنەی هەرێی مێردەکەی ناداتەوە:

لەصەحیحی بوخاریدا، لەئەبو هورەیرەوە ﷺ هاتوە دەڵیٚ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: (اذا دعا الرجل امرأته الى فراشه فأبت. فبات غضبان لعنتها

الملائكة حتى تصبح: ئەگەر پیاوێك ژنەكەی خۆی بۆ سەر جێگاكەی گازكرد و نەهات و، پیاوە بەتوڕەیی شەوی كردەوە، هەتا بەیانی فریشتەكان نەفرەت لەو ژنە دەكەن).

## نەفرەتكردنیان لەوكەسەی بەئاسنێك ئاماژە بۆ براكەی دەكات:

موسلیم لە صەحیحەكەیدا، لەئەبوهورەیرەوە ﷺ دەگێڕتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "من أشار الى اخيه بحديدة فان الملائكة تلعنه. وان كان أخاه لابيه وامه: هەركەسێكی بەپارچە ئاسنێك ئاماژە بۆ براكەی بكات. ئەوا فریشتەكان نەفرەتی لێ دەكەن. جا بابرایەكەی لەدایك وبابیشی بێ".

نەفرەتی فریشتانیش بەڵگەیە لەسەر حەرامی ئەم كارە. چونكە ترساندنی برایەكەی تێدایە. رەنگە شەیتانیش لەسنوری دەركاو براكەی بكوژێ، بەتایبەتی ئەگەر چەكەكە لەو جۆرە نوێیانەبو، كەبەهەڵەیەكی بچوك فیشەكێكی لێ دەرچێ و كارەساتێك بنێتەوە. نمونە وبەسەرهاتی زۆریش لەم بابەتە رویان داوە.

## نەفرەتی فریشتان لەوانەی جوێن بەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەدەن:

لە (المعجم الكبير)ی طەبەرانیدا لەئیبنیعەبباسەوە ﷺ بەسەنەدێكی چاك هاتوە، كەپێغەمبەر ﷺ فەرموی: "من سب اصحابي فعليه لعنة الله والملائكة والناس اجمعين: ئەوكەسی جوێن بەهاوەڵانی من بدا، نەفرەتی خوداو فریشتان و سەرجەم خەڵكی لەسەرە.

جا چەند سەیرو سەمەرەو سەرسوڕهێنن ئەوخەڵك و قەومانەی كەجوێن دانیان بەهاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەر ﷺ كردۆتە دین و دەیانەوێ پێی لە

خوا نزیك بنەوە. لەگەڵ ئەوەی کە سزایان ئەو سزا توندەیە پێغەمبەری خودا ﷺ لەم فەرمودەیە باسی کردوە.

### نەفرەتیان لەوانەی رێ لەبەرپاکردنی شەرعی خوا دەگرن:

لەسونەنی نەسائی و ئەبوداود و ئیبنیماجەدا بەسەنەدێکی صەحیح لەئیبنیعەبباس ﷺ هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "من قتل عمداً فقود يديـــه. فمن حال بينه وبينه فعليه لعنـــة الله. والملائكـــة. والنـــاس اجمعـــين: هەر کەسێکی بەقەستی یەکێك بکوژێ تۆڵەی ئەو خوێنەی لێ دەکرێتەوە. جا هەرکەسێکی نەیەڵی تۆڵەی لێ بکرێتەوە. نەفرەتی خوداو، فریشتەکان و، سەرجەم خەڵکی لەسەرە".

جا هەرکەسێك بەپایە و ماڵ و سامان ببێتە بەربەست لە جێبەجێ کردنی حوکمی خودا لەکوشتنی بکوژێك کەبەدەستی ئەنقەست یەکێکی کوشتبێ وەبەر ئەو نەفرەتەی دەکەوێ. ئەدی ئەوی دەبێتە بەربەست لەرێی پیادەکردنی تێکرای شەریعەت دەبێ چۆن بێ؟!

### ئەوەی داڵدەی داهێنەرێك بدات:

لەوانەی فریشتەکان نەفرەتی لێدەکەن، هەروەکو خوا نەفرەتیان لێدەکا، ئەوانەن شتی نوێ لەدینی خوا دادەهێنن، بەوەی کەلە حوکمەکانی دەردەچن و، دەست درێژی دەکەنە سەر شەرعەکەی. یان ئەوانەی ئەو جۆرە کەسە داڵدە دەدەن و دەیپارێزن، هەروەك لەفەرمودەیەکی صەحیح دا هاتوە: (مـــن احدث حدثاً أو آوى محدثاً، فعليه لعنة الله والملائكة والنـــاس اجمعـــين: هەرکەسێکی شتێکی نوێ لەئیسلام دابهێنێ. یان داڵدەی یەکێکی وابداو بیگرێتە خۆ.

**نەفرەتی خوداو فریشتان و تێکڕای خەڵکی لەسەرە)** رواه ابـــوداود والنســـــائي والحاكم. (صحيح الجامع ٦/٨).

**داهێنـانی شـتی زێـدەش ئەگـەر لەمەدینـەدا بـو تـاوانێکی گـەورەترە، هەروەك لەپێغەمبەر ﷺ ەوە هاتوە:** (المدينة حرام. مابين عير الى ثور. فمن احــدث فيها حدثاً. او آوى محدثاً. فعليه لعنة الله. والملائكة والناس أجمعين. لايقبل الله منه يـــوم القيامة صرفاً؛ ولا عدلاً: **مەدینـە حەرامـە هـەر لـەکێوی عـەیرەوە تـاکێوی ثـەور، ئەوی شتێکی نوێی تێدا داهێناو زیادی کرد بۆ ئیسلام یاداهێنـەرێکی گرتـە خۆو داڵـدەی دا. نـەفرەتی خـوداو، فریشـتەکان و، تێکـرای خـەڵکی لەسـەرە. لەڕۆژی قیامەت دا خودا نە تۆبەو ژیوانی لێ قبول دەکا نە داد وعەدالەت)** رواه البخاري ومسلم.

## دیتنی فریشتان:

**ئادەمیزاد ناتوانن فریشتان ببینن، چونکە خودا ئەو توانایـەی بـەچاوی مرۆڤ نەداوە فریشتەی پێ ببینی.**

**لەپێغەمبـەریش ﷺ بـترازێ کەسـی دی لــەو ئوممەتــە فریشــتەکانی بەوێنـەی راسـتەقینەی خۆیـان نـەدیوە. پێغەمبـەر ﷺ دو جـار جیـبریلی بـەو شێوەیە دیـت کـەخودا ئافـەریدەی کـردوە هـەروەك باسمـان کـرد. هـەروەها لەپێشـدا لـەوەش دواین کـە مـرۆڤ توانـای دیـتنی فریشـتانیان هەیـە، ئەگـەر فریشتەکان خۆبێننە سەر وێنەی مرۆڤ.**

## داخوازی بێبڕوایان بۆ دیتنی فریشتان:

**بێبڕوایـان داوایـان کـرد فریشـتان ببینـن وەکـو بەڵگـە بـۆ راسـتگۆیی پێغەمبـەر ﷺ . جـا خـوای گـەورە پێـی راگـەیاندن ئـەو رۆژی فریشـتەی تێـدا دەبینن رۆژێکی رەش دەبێ بۆ وان. چونکە بێبڕوایـان ئـەو کاتـە فریشـتەکان بەدیدەکەن کەتوشی ئازارو ئەشکەنجەی خـودا دێن. یا ئـەو کاتـەی مـرۆڤ**

دەمریٚ و پەردەی لەڕو لادەچیٚ: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءَنَا لَوْلاَ أُنزِلَ عَلَيْنَا الْمَلاَئِكَةُ أَوْ نَرَى رَبَّنَا لَقَدْ اسْتَكْبَرُوا فِي أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْا عُتُوًّا كَبِيرًا، يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلاَئِكَةَ لاَ بُشْرَى يَوْمَئِذٍ لِلْمُجْرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَحْجُورًا: وەئەوانی هیوایان بەدیداری ئیٚمە نیە و ڕۆژی بەریٚ ئینکاردەکەن دەڵیٚن بۆچ فریشتە بۆ ئیٚمە نازڵ نابیٚ؟ یان پەروەردگارمان بەچاو نابینین؟لەڕاستیدا ئەوانە فیزیان زلەو خۆیان بەگەورە دا دەناو نافەرمانیانی گەورەیان کرد. بەلاّم ڕۆژیٚك کەفریشتەکان دەبینن ڕۆژی مزگیٚنی تاوانباران نابیٚ، بەڵکو ڕۆژی سزا دانیانە! جا دەڵیٚن: پەنامان بدەو سەلامەتمان کە ﴾ سورة الفرقان/٢١-٢٢.

## بۆ خودا پیٚغەمبەرەکانی لەفریشتان ڕەوان ناکا ؟

خودا پیٚغەمبەرەکانی خۆی لە فریشتان ڕەوان ناکا، چونکە سروشتی فریشتان جیاوازە لەسروشتی مرۆڤ و، پەیوەندیشیان بەفریشتان ئاسان نیە، بۆیەش هەروەك پیٚشتر باسمان کرد، زۆر ناخۆش بو بۆ پیٚغەمبەر ﷺ کەجیبریل بەسیفەتە فریشتانەکەی خۆی دەهاتەلای. کاتیٚك جیبریلیشی بینی لەسەرشیٚوەی خۆی، ترساو هاتەوەلای خیٚزانەکەی و فەرموی داپۆشن داپۆشن.

جا کە سروشتەکان جوایەزن، خوای گەورە وا ویستی لیٚ بوە لەرەگەزی خۆیان پیٚغەمبەریان ﷺ بۆ بنیٚریٚ. ئەگەر دانیشتوانی زەویش فریشتە بان فریشتەیەکی بەپیٚغەمبەر بۆ دەناردن، خوای بەرز دەفەرمیٚ: ﴿ قُل لَّوْ كَانَ فِي الأَرْضِ مَلاَئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِمْ مِنْ السَّمَاءِ مَلَكًا رَسُولاً: بلیٚ؛ ئەگەر لەسەر زەوی فریشتە بونایەو بەئارامی هاتوچۆیان کردبا. ئیٚمەش فریشتەیەکمان وەکو پیٚغەمبەر، لەئاسمانەوە بۆ دادەبەزاندن ﴾ سورة

الاسراء/٩٥. ئەگەر واش دانێین خودا پێغەمبەرەکانی خۆی بۆ سەرجەم مرۆڤان لەفریشتان هەڵبژاردبا، ئەوکاتیش بەوێنە فریشتانەکەی خۆیان داینەدەبەزاندن. بەڵکو وای لێدەکردن بچنە سەر شێوەو سیفەتی پیاوان وچی پیاو دەیپۆشین، ئەویان لەبەر دەکرد، تا خەڵك بیانتوانیبا لێیان وەرگرن: ﴿ وَقَالُوا لَوْلاَ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَقُضِيَ الأَمْرُ ثُمَّ لاَ يُنظَرُونَ، وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكًا لَجَعَلْنَاهُ رَجُلاً وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِمْ مَا يَلْبِسُونَ: وەکافران گوتیان: ئەدی بۆ فریشتەیەك لەگەڵ موحەممەد دانەبەزی، دیارە ئەگەر فریشتەمان بناردبا کاری تاقی کردنەوە تەواو دەبو، چی دی مۆڵەتی ژینیان نەدەدرایێ. وەئەگەر پێغەمبەرمان بکردبا بەفریشتەیەك، هەردەبو بەوێنەی مرۆڤ بوایەو، جل وبەرگی مرۆڤمان لەبەر دەکرد و لێمان دەشوبهاندن ﴾ سورة الانعام/٨-٩. جا خودای بەرز ئەوەی پێ راگەیاندون، کەداوای کافران بودیتنی فریشتان و هاتنی پێغەمبەرێك لەفریشتانەوە، هەر خەزرین و جنەگرتنێکەو هیچی تر، نەك داوایەك بێ بۆ رێنوێنی. ئەگەر روشی بدابایە ئەوان هەر باوەڕیان نەدەهێنا: ﴿ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلاَئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَى وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلاً مَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ : ئەگەر ئێمە فریشتەمان بناردبان و، مردوەکان لەگەڵیان دا ئاخاوتنیان بکردبا و، هەمو شتێکمان لەبەرامبەر ئەوان کۆکردباوە، هێشتا بڕوایان نەدەهێنا، مەگەر خودا بیەوێ، بەڵام زۆرینەی ئەوانە نەزان و بێ ئاگان ﴾ سورة الانعام/١١١.



لەبەندی پێشو باسی پەیوەندی نێوان فریشتان و ئادەمیزادم کرد. ئەمەش هەمو ئەو شتانە نیە کەبەفریشتان ئەسپاردە کراوە. بەڵکو فریشتە بەکاروبارە جیاجیاکانی بونەوەر هەڵدەستن، لەوانەی ئێمە دەیانبینین و لەوانەش کەنایانبینین.

جا تەنیا هەندێك دەقان دێنمەوە کەلەو بابەتە هاتون.

## هەڵگرانی عەرش:

عەرش مەزنترین ئافەریدەیە، لەسەروی ئاسمانەکانەو دەوری داون، خودای بەرزو پەخشەندە لەسەری بەرزبۆتەوە. هەشت فریشتەش عەرش هەڵدەگرن: ﴿ . .وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ: وە لەوروژەدا هەشت لەفریشتان عەرشی پەروەردگارت بەسەر سەریانەوە هەڵدەگرن ﴾[1] سورة الحاقة/١٧.

## فریشتەی چیاکان:

چیاکانیش فریشتەیان هەیە، جا خوای گەورە فریشتەی چیاکانی هەناردە لای موحەممەدی بەندەو پێغەمبەری خوی ﷺ، تا فەرمانویستی لێبکا بو لەناوبردنی خەڵکی مەککە، لەصەحیحی بوخاری و موسلیمدا لەعائیشەوە(رضي الله عنها) هاتوە کەلەپێغەمبەری ﷺ پرسی: ئایا چ روژێکت بەسەرهاتوە سەختتر و ناخوشتر بێ لەروژی ئوحود؟فەرموی: "لقد لقيت من قومك ما لقيت. وكان اشد مالقيت منهم يوم العقبة (مكان بمنى) . اذ عرضت نفسي على ابن عبد ياليل بن كلال. فلم يجبني الى ما اردت. فانطلقت وأنا مهموم على

[1] پێشتر باسی مەزنێتی ئافەریدەی ئەو فریشتانەمان کرد، لەو بەندەی باسی سیفەت و تواناکانی فریشتانمان تێداکردوە.

وجهي. فلم استفق الا وانا بقرن الثعالب (موضع قرب مكة) فدفعت رأسي فاذا انا بسحابة قد اظلتني. فنظرت فاذا فيها جبريل فناداني. فقال: ان الله قد سمع قول قومك لك.ومارد وبه عليك. قد بعث الله اليك ملك الجبال لتأمره بما شئت فيهم. فناداني ملك الجبال فسلم علي. ثم قال: يا محمد. فقال ذلك فيما شئت. ان شئت ان اطبق عليهم الاخشبين (جبلا مكة ابو قبيس والاحمر وجبلا منى) . فقال النبي ﷺ: بل ارجو ان يخرج الله من اصلابهم من يعبد الله لايشرك به شيئاً: **ئەوەی بەدەست هۆزەكەی تۆم دیت، دیتم. ناخۆشترین بەسەرهاتیشم لەگەڵیان رۆژی عەقەبە بو. داوای داڵدەم لە ئیبنی‌عەبدیالیلی كوڕی كەلال كرد، وەلامی نەدامەوە. زۆر بەدڵتەنگی و خەمباری سەرم لەبەر خۆم ناو رۆیشتم. وەختێك وەئاگاهاتم گەیشتبومە (قرن الثعالب-كە لەنزیك مەككەیە) سەرم بڵندكرد بینیم هەورێك سێبەری لێكردوم، كەسەیرم كرد جیبریلی تێدایەو بانگی كردم و گوتی: خودا قسەی هۆزەكەتی بیست و، گوێی لێ بو كویان وەلام دایەوە. جا خودا فریشتەی چیاكانی بۆ ناردوی تاكو پێت باشە چییان بەسەربێ، بەوە فەرمانی پێ بكەی. ئەوجا فریشتەی چیاكان سلاوی لێ كردم، پاشان گوتی: ئەی موحەممەد، مەبەست ئەوەیە هەرچیت گەرەكە. ئەگەر دەتەوێ هەردو چیای مەككەو هەردو چیای مینایان بەسەردا دەدەمەیەك. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەڵكو تكام وایە خودا لەڕەچەڵەك و پشتی وان كەسانێك پەیدابكا خودا بپەرستن و هیچ هاوبەشی بۆ دانەنێن ".**

## ئەو فریشتانەی باران و روەك و بژێویان پێ ئەسپاردەكراوە:

**ئیبنی كەثیر لە (البدایة والنهایة ١/٥٠)دا دەڵێ: میكائیل باران و روەكی پێ سپێردراوە كە رۆزیەكانی ئەم دونیایەیان لێ ئافەرید دەكرێ، هاریكاریشی هەن چ فەرمانێكی بیكا بەفەرمانی خوا، بۆی جێبەجێ دەكەن، چۆن پەروەردگاری خاوەن دەسەلات و كاربەجێ دەیەوێ، ئاوها هەورو بایان**

دێنن و دەبەن و دابەشیان دەکەن، ئەوەشمان گێڕاوە کەهەر دلۆپێك لە ئاسمانێ دابەزێ فریشتەیەکی لەگەڵە، لەشوێنی خۆی لەزەویدا دایدەنێ.

فریشتە هەن هەورەکانی پێ سپێردراوە، لەسونەنی تەرموذیدا لە ئیبنیعەبباس هاتوە، کەپێغەمبەر ﷺ فەرموی: "الرعد ملك من ملائكـــة الله. موكل بالسحاب. معه مـــخاريق من نار. يسوق بها السحاب حيث شــــاء الله: رەعد یەکێکە لەفیشتەکانی خودا، بەهەوران ئەسپاردەکراوە. قامچی ئاگرینی پێیە، بۆکوێی خودا بیوێ هەورانی پێ داژوا" (صحيح الجلمع ٣/١٨٨)، جارەنگە ئەو هەورە وڵاتێك ئاو بداو یەکێکی دی ئاونەدا، یا گوندێك تێراو بکاو ئەوی دی نا، رەنگە فەرمانیشی پێ بکرێ تەنها کێڵگەی تاکە پیاوێکی بەتەنێ ئاوبدا، هەروەکو موسلیم لەصەحیحەکەیدا لەئەبوهورەیرە‌ﷺ دەیگێڕتەوە، لەپێغەمبەر ﷺ فەرموی:"بينا رجل بفلاة من الارض. فسمع صوتاً في سحابة يقــول: اسق حديقة فلان. فتنحى ذلك السحاب. فأفرغ ماءه في حرة. فاذا شرجة مـــن تلـــك الشراج قد استوعبت ذلك الماء كله. فتتبع الماء فاذا رجل قائم في حديقته يحول المــــاء بمسحاته. قال له: ياعبدالله ما اسمك؟قال: فلان. للاسم الذي سمع في السحابة. فقال له: يا عبدالله لم تسألني عن اسمي ؟ قال: اني سمعت صوتاً من في السحاب الذي هذا مـــاؤه يقول: اسق حديقة فلان. لاسمك. فما تصنع فيها ؟قال: اما اذ قلت هذا. فاني أنظــر الي مايخرج منها. فأتصدق بثلثه. وآكل أنا وعيالي ثلثاً. وأرد فيها ثلثــاً: جارێك کابرایەك لەچۆلەوانیەك، گوێی لەدەنگێك دەبێ لەناو هەورێك دا دەڵێ: باخچەی فلانەکەسی ئاودە. جا هەورەکە وەلا کەوت و، ئاوەکەی خۆی لەزەویەکی بەردەڵاندا خاڵی کرد، ئەوجا کەلێنێك هەمو ئاوەکەی گرتە خۆ، کابرا بەدو ئاوەکەی داچو، تا گەیشتە پیاوێکی خەریك بو لە باخچەکەی خۆی ئاوەکەی رادەدا. بەپیاوەکەی گوت: ئەی بەندەی خودا ناوت چی یە؟ گوتی: فلان، بەوناوی لەهەورەکەدا گوێی لێ بو، پیاوەکە گوتی: ئەی بەندەی خودا بۆچی لەناوی من دەپرسی؟ کابرا گوتی: من گوێم لەدەنگێك بو لەناو ئەو هەوری

ئەم ئاوەی لێ هاتوە دەیگوت: باخچەی فلانی ئاودە. ناوی تۆی هێنا، تۆ چی لێ دەکەی؟پیاوەکە گوتی: ئەگەر لەهەندێ دەپرسی: ئەوا من تەماشا دەکەم چی لێ دەردەچێ، جا سێیەکی دەکەمە خێرو، بەخۆو منداڵەکانم سێیەکی دەخۆم و، سێیەکیشی لێدەدەمەوە".

جا فریشتەکان کاروباری ئاسمانەکان و زەوی یان ئەسپاردەکراوەو، هەمو جوڵەیەك لە جیهاندا لەمەڕ فریشتانە، هەروەك خوای بەرز دەفەرمێ: ﴿ فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا ﴾: جا سوێند بەوان فریشتان کە بەڕاوتەکبیر کاردەکەن ﴾ سورة النازعات/٥. هەروا دەفەرمێ: ﴿ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا: جا سوێند بەفریشتەگەلی کەکاران دابەش دەکەن ﴾ سورة الذاريات/٤. ئەوانی پێغەمبەران وەدرۆ دەخەنەوە و بڕوایان بەئافەریدگار نیە، دەڵێن: ئەستێرەکانن بەو هەمو کارانە هەڵدەستن و درۆ دەکەن. ئەوی ئەو کارانە جێبەجێ دەکا فریشتەکانن و بەفەرمانی خوای بەرز پێی هەڵدەستن، هەروەك دەفەرموێ: ﴿ وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا، فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا، وَالنَّاشِرَاتِ نَشْرًا، فَالْفَارِقَاتِ فَرْقًا، فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْرًا: سوێند بەو بایانەی لەپشت سەریەك دەنێردرێن و، بەو بایانەی سەخت و بەگژەگژ هەڵدەکەن و بەو بایانەی هەوران بڵاودەکەنەوەو سوێند بەوانەی هەور بەسەر وڵاتاندا دابەش دەکەن یا (هەق و ناهەق جیادەکەنەوە). جا سوێند بەوانەی یادی خوا فێری پێغەمبەران دەکەن ﴾ سورة المرسلات/١-٥. هەروەها دەفەرمێ: ﴿ وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا، وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا، وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا، فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا، فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا: سوێند بەو فریشتانەی گیانی تاوانبارن بەتوندی دەکێشن. بەوان فریشتانیش سوێند کەگیانی بڕواداران بەئەسپایی دەکێشن. وەسوێند بەفریشتەگەلێ کەخێرا بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خوا دەڕۆن. سوێندیش

**بەو فریشتانەی کەپێش دەکەون. جا سوێند بەوانە کە بە ڕاوتەگبیر کاردەکەن** ﴾ سورة النازعات/١-٥. **دیسان دەفەرمێ:** ﴿ وَالصَّافَّاتِ صَفًّا، فَالزَّاجِرَاتِ زَجْرًا، فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا: **سوێند بەو فریشتانەی کەریزیان بەستوەو ریزی خۆیان تەکوزو لەبارکردوە. وەسوێند بەدورخەرەوان لەتاوان و خراپە. وە سوێند بە خوێنەرانی قورئان** ﴾ سورة الصافات/١-٣.

**ئەم ئایەتە پیرۆزانەش هەمو باسی فریشتانە کەکاروباری ئاسمانەکان و زەوی ڕێك دەخەن و جێبەجێ دەکەن.**



**جیاڕایی لەمەسەلەکەدا کۆنە:**

ئیبنی کەثیر لە (البداية والنهاية: ٥٨/١) دا دەڵێ: خەڵکی جیاڕان لە چاکتر دانانی فریشتان لە مرۆڤ و گۆتەی جیاجیاشیان هەیە! ئەم بابەتە زێتر لە کتێبەکانی ئەهلی کەلامدا هەیە. جیاوازیشی تێدا لەگەڵ موعتەزیلەکان و هاوڕایانی وانە. کۆنترین قسە کە من بەرگوێم کەوتبێ لە بابەت ئەم مەسەلەیە، ئەوەیە کە ئیبنی عەساکیری حافیظ لە مێژوەکەیدا، لە ژینامەی ئومەیەی کوڕی عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص دا باس دەکا: جارێك ئومەییە لە کۆڕێکی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئامادە بو، کۆمەڵێکیش لەو مەجلیسەدا بون، جا عومەر گوتی: هیچ یەکێك نیە لەلای خودا لە ئادەمیزاد پایەدارو بەرزتر بێت، ئەم ئایەتەشی بە بەڵگە بۆ قسەکانی هێناوە: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُوْلَئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ : بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کاری چاکیان کردوە، هەر ئەوانە باشترینی ئافەریدەکانن ﴾ سورة البينة/٧.

ئومەییەی کوڕی عەمری کوڕی سەعید، لە گەڵیدا یەك دەنگ بو، بەڵام عەراکی کوڕی مالیك گوتی: کەس لەلای خودا هێندەی فریشتان رێزی نیە، ئەوان راژەکاری هەردو خانەی خودان و، پەیامبەری خوان بۆ پێغەمبەرەکانی، ئەم ئایەتەشی کردە بەڵگە؛ ﴿ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنْ الْخَالِدِينَ : پەروەردگارتان بۆیە ئێوەی لەم دارە نەهی کردوە، چونکە نەیویست ئێوە ببنە دو فریشتە یا بۆ هەمیشە لە بەهەشت بمێننەوە ﴾ سورة الأعراف/٢٠.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بە موحەممەدی کوڕی کەعبی ئەلقەرەضی، گوت: ئەتۆ چ دەڵێی ئەبو حەمزە؟ گوتی: خودا رێزو پایەی لە ئادەم نا

بەوەی بە دەستی خۆی ئەفراندی‌و، بەفوی خۆی رۆحی کرد بەبەرداو، فریشتەکانی خۆی بۆ بردە سوژدەو، لە نەوەی وی پێغەمبەرانی هەنارد و ئەوانەش کە فریشتە سەردانیان دەکەن، ئەمیش هەمان رای عومەری هەبو بەڵام بەڵگەی تری بۆ هێناوە، جا ئەوەی ئیبنی کەثیر هێناویە لە قسەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو پیاوانی مەجلیسەکەی بە هەڵە چونی تاجەدینی فەزاری ئاشکرا دەکا، کە دەڵێ: (ئەم مەسەلەیە لە بیدعەکانی عیلمی کەلامە کە کەس لێی نەدواوە لە پێشینەکانی نەوەی یەکەمی ئەم ئوممەتەو پێشەوا رابەرەکانی پێشەوانیش)(شرح الطحاوية/٣٣٩). بەڵکو هەندێك لە هاوەڵان ئاخاوتنیان لەم بابەتە هەیە. ئەوە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام دەڵێ: خودا کەسی ئافەریدە نەکردوە هێندەی موحەممەد ﷺ بەرێز بێ. پێیان گوت: تەنانەت جبریل و میکائیلیش؟ گوتی: (دەزانی جبریل و میکائیل چین؟ جبریل و میکائیل رام و موسەخخەرن وەکو رۆژ و مانگ، خودای گەورە کەسیشی ئافەریدە نەکردوە رێزدار تر بی لەلای لە موحەممەد ﷺ،حاکیم لەموستەدرەکدا ریوایەتی کردوە لەگەڵ ذەهەبی بە صەحیحیان داناوە (بگەرێوە بۆ شرح الطحاوية بتحقيق الألباني ص: ٣٤٢).

## ئەوەی لەم بابەتەوە گوتراوە:

راڤەکاری طەحاوی دەڵێ؛ ئەهلی سوننەت و جەماعەت پێیان وایە کە صالح و چاکەکانی مرۆڤ و پێغەمبەرەکان، تەنیا ئەوانە بەسەر فریشتانیان دا هەیەو لەوان چاکترن. موعتەزیلە فریشتەکان بە چاکتر دادەنێن، ئەشعەریەکانیش دو گۆتەیان هەیە، هەیانە پێغەمبەران و پیاوچاکان بە چاتر دادەنێ و، هەشیانە لەمەسەلەکە دەوەستێ و چ قسەی تێدا ناکا، لەبڕێکیشیان هاتوە کەفریشتە بەچاکتر دەزانن. ئەمەش لەغەیری وان لە ئەهلی سوننەت و هەندێك سۆفیانیش هاتوە، شیعەش دەڵێن: هەمو

پێشەواكان لەهەمو فریشتەكان باشترن، خەڵكانیش هەن بە شێوازی دی بابەتەكەیان هورد كردۆتەوە، هیچ كەسیش لەوانەی قسەیان وەردەگیرێ نەیگوتوە فریشتەكان لە هەندێك پێغەمبەران چاكترن و لەوانی دیكەش نا. دەشڵێن ئەبو حەنیفە ﷺ لەم پرسیارە راوەستاوەو وەلامی نەداوەتەوە. راڤەكاری طەحاویش ﷺ هەر ئەو وەستانەی پێ باش بوە، (شرح العقيدة الطحاوية/٣٣٨) .

هەروەها سەفارینی لە (لوامع الأنوار ٣٩٨/٢) دا دەڵێ: ئیمام ئەحمەد ﷺ دەیگوت: (ئەوەی فریشتان بە چاكتر دانێ بە هەڵە داچوە، دەشڵێ: هەمو ئیماندارێك لە فریشتان چاكترە) .

## شوێنی كێشەكە:

گومان لەوە دانیە كە بێ بڕواو دەغەلەكان ناچنە ناو جوغزی بەسەردا هەبون و بابەتەكە ئەوان ناگرێتەوە، چونكە ئەوان لە ماڵاتان گومڕاترن ﴿ ..أُوْلَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ.. : ئەوانە وەكو ماڵات وان، بەڵكو لەوانیش گومڕاترن ﴾ سورة الأعراف/١٧٩.

مەبەستیشیان لە چاكتر بون بەسەردا هەبون؛ دیاری كردنی چاكتر نیە لە نێوان حەقیقەتی مرۆڤ و حەقیقەتی فریشتان، بەڵكو مەبەستمان بەسەردا هەبونە لە نێوان صالح و كارچاكانی مرۆڤ و فریشتان، ئەگەرچی خەڵكانێك وای بۆ دەچن فریشتە لە ئیماندارانی دیكە چاكترن و، لە لای ئەوان كێشەكە لەبەسەردا هەبونە لە نێوان پێغەمبەران و فریشتان.

## بیانوی ئەوانەی مرۆڤی صالح لەفریشتان چاكتر دادەنێن:

پاش ئەوەی شوێنی كێشەكەمان دیاری كرد بیانوی ئەوان رون دەكەینەوە كە مرۆڤ بەچاكتر دادەنێن:

**بەڵگەی یەکەم: خودا فەرمانی بە فریشتان کرد سوژدە بۆ ئادەم ببەن. جا ئەگەر چاکتر نەبوایە. فەرمان بە فریشتان نەدەکرا سوژدەی بۆ ببەن** ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ **: ئەو دەمەی بە فریشتەکانم گوت: سوژدە بۆ ئادەم ببەن، هەمو بێجگە لەئیبلیس سوژدەیان برد ئیبلیس نافەرمانی کرد و خۆی بە زل زانی و لەکافران بو** ﴾ سورة البقرة/٣٤.

**هەندێك دەڵێن سوژدەکە بۆ خودا بوەو، ئادەم تەنها روگە بوە. ئەگەر ئەمە راست بوایە دەیفەرمو:** ﴿ أسجدوا الی آدم: **بەرەو ئادەم سوژدە ببەن** ﴾، **نەیدەفەرمو** ( اسْجُدُوا لِآدَمَ ).

**ئەگەر مەبەستیش هەر ئەمە بوایە ئادەم بکرێتە روگە، ئیبلیس سەرکێشی نەدەکردو، واشی دانەدەنا کە ئەو لە ئادەم چاکترە، چونکە روگە لە بەرد پێك دێ و کە بشکرێتە روگە چ زیاد و کەم ناکا.**

**راستە سوژدەبردنی فریشتان بۆ ئادەم پەرستش بو بۆ خوداو، تاعەتێك بو لە خودای نزیك دەکردنەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا گەورەکردن و رێزلێنان و بەرزو بڵندکردنەوەی ئادەم بو.**

**ئەوەش نەهاتوە ئادەم سوژدەی بۆ فریشتان بردبێ، تەنانەت ئادەم و زارۆکانی فەرمانیان پێ نەکراوە جگە لە خودای پەروەردگاری جیهانیان، بۆ کەسێکی دی سوژدەی ببەن. لەبەر ئەوەی** والله أعلم **- ئەوان پایەدار ترینی جۆرەکانن، کە صالح و کارچاکانی نەوەی ئادەمن، لە هەوراز ئەوان کەسێك نیە شیاوی سوژدە بێ جگە لە خودای پەورەردگاری جیهانیان.**

بەڵگەی دووەم: خودای گەورە لە ئیبلیس دەگێڕێتەوە: ﴿ قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ : ئایا دیتت ئەوەی کە لە باتی من هەڵتبژاردوەو لە من پتر رێزت گرتوە ﴾ سورة الأسراء/٦٢.

جا ئەم دەقە پیرۆزە پایەدار تر و بەرزتر کردنی ئادەمە بەسەر ئیبلیس. کە فەرمانی پێ کراوە سوژدەی بۆ ببات.

بەڵگەی سێیەم: خودای بەرز ئادەمی بە دەستی خۆی ئافەریدە کرد، فریشتەکانیشی بە وشەی خۆی ئەفراند.

بەڵگەی چوارەم: خودای بەرز دەفەرموێ: ﴿ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً : من لە زەویدا جێنشینێك دادەنێم ﴾ سورة البقرة/٣٠.

جا جێنشین بەسەر ئەو کەسیدا هەیە کە جێنشین نیە، فریشتەکانیش داوایان کرد جێنشینی بەوان ببڕێو، جێنشین لەوان بێ، گوتیان: ﴿ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ : ئایا کەسێك لە زەوی دەکەیە جێنشین کە فەساد و خوێنرێژی بکا ﴾ سورة البقرة/٣٠.

جا ئەگەر جێنشین پلەو پایەیەکی بەرزتر نەبایە لە هی وان، داوایان نەدەکرد چاویان لە جێ و شوێنی وان نەدەبو.

بەڵگەی پێنجەم: ئادەمیزاد بە زانستیش بەسەر فریشتانیاندا هەیە، کاتێك خودای بەرز و بە توانا لە بارەی زانستی ناوان پرسیاری لێ کردن و ئەوان وەلامیان نەداوەو، دانیان نا بەوەی شارەزا نین. جا ئادەم پێی راگەیاندن. خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ

يَعْلَمُونَ: ئايا ئەوانەی زانا و شارەزان لەگەڵ ئەوانی نازانن وەكو یەكن ﴾ سورة الزمر/٩.

**بەڵگەی شەشەم:** تاعەت كردنی مرۆڤ لە هی فریشتان زەحمەت و ئەستەم ترە. زەحمەت تریش خێری پترە، ئەمەش دەبێتە بەڵگەی بەسەردا هەبونی مرۆڤ، چونكە مرۆڤ ماكی گرتوە بە ئارەزو و هەتەری و توڕە بون و هەوەس. فریشتەش ئەمەیان نیە.

**بەڵگەی حەفتەم:** پێشینەكان ئەوان فەرمودانیان دەهێناوە كە باسی چاكتری و بەسەردا هەبونی مرۆڤی صالح لە ئاست فریشتەكانی دەگرتە خۆ. جا ئەو فەرمودانەیان لە ناو خەڵكی دەگێڕایەوە. ئەگەر پێیان راست نەبا ئینكاریان دەكرد. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر رێكەوتنی بیروباوەڕیان لەم مەسەلەیەو ڕازی بونیان پێ ی.

**بەڵگەی هەشتەم:** خوای گەورە شانازی بە بەندەكانی خۆی دەكا بەرامبەر فریشتان، ئەگەر ئەو ئەركانەیان جێبەجێ كرد كە خوا لەسەری داناون و فەرمانی پێ كردون.

ئەگەر نوێژی فەرزیان كرد شانازی‌یان پێوە دەكا لە ئاست فریشتان. لە موسنەدی ئەحمەد و لە ئیبنی ماجەدا لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: " أبشروا هذا ربكم قد فتح باباً من أبواب السماء، يباهي بكم الملائكة، يقول: أنظروا الى عبادي قد قضوا فريضة، وهم ينتظرون أخرى: موژدەتان لێ بێ، ئەوا پەروەردگار دەرگەیەكی لە دەرگەكانی ئاسمان كردەوە. شانازی بە ئێوە دەكا لە ناو فریشتان و دەفەرموێ: سەیری بەندەكانم بكەن وا فەرزێكیان جێبەجێ كردو چاوەڕوانی یەكێكی دیكەن " (صحيح الجامع ٦٧/١).

**هەروەها لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** "(إن الله يباهي بأهل عرفات أهل السماء، فيقول لهم: أنظروا الى عبادي هؤلاء جاؤوني شعثاً غبراً: **خودا شانازی بە ئەهلی عەرەفات دەکا لە ئاسمان نشینان و پێیان دەفەرموێ: سەیری ئەو بەندانەی من بکەن وا بەسەری کراوەو تۆزاویەوە هاتونە لای من** " (إسناده صحيح، رواه إبن حبان و الحاكم والبيهقي في السنن -صحيح الجامع ٢/١٤١).

**ئەوانەی دەشڵێن فریشتە بەسەر مرۆیاندا هەیە و چاکترن بیانگیان ئەم فەرمودەو هاوشێوەی ئەمەیە، کە دەفەرموێ:** "من ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي، ومن ذكرني في ملأ ذكرته في ملأ خير منهم: **ئەوەی لەگەڵە خۆی یادی من بکا، لەگەڵ خۆم یادی دەکەم. ئەوەی لە ناو کۆمەڵێك یادم بکا، لە ناو کۆمەڵێك چاکتر لەوان یادی دەکەم**".

**بیانوشیان بەوە هێناوەتەوە کە ئادەمیزاد، کورت هێنان و کەم و کوڕییان تێدایەو، دەکەونە هەڵەو پەلإن. بەڵگەی بەو ئایەتە دەهێننەوە کە دەفەرموێ:** ﴿ وَلَا أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ : **و بە ئێوەش ناڵێم من فریشتەم ئەمەش بەڵگەیە کە فریشتە لە مرۆڤ چاکترن** ﴾ سورة الأنعام/٥٠.

## گۆتەی راست و دروست لەم مەسەلەیەدا:

**قسەی راست و دروستی ئەم بابەتە ئەوەیە کە ئیبنی تەیمیە باسی دەکا کە مرۆڤی صالح چاکترن بە رەچاوکردنی تەواوێتی کۆتاییو ئاکام، ئەمەش لەو کاتەدا وەدی دێ کە دەچنە بەهەشتێ و نێزیکی وەدەست دێنن و، لە پلەبەرز و بالإکاندا رۆدەنیشن و، خودای بەخشندەو میهرەبان سڵاویان لێدەکاو بە فرە نێزیکی لە خۆی تایبەتیان دەکاو، خۆیان بۆ دەردەخاو،**

ئەوانیش بەدیتنی روی شکۆداری بەرخوردار دەبن و، فریشتەکان بە مۆڵەتی پەروەردگار لە راژەیان دا دەبن.

بەڵام فریشتە چاکترن بەرەچاو کردنی سەرەتا، چونکە ئەوان ئێستاکێ لە هاوەڵێتی بالإدان. پاکن لەوەی ئادەمی تێی دەکەون، لە پەرستنی پەروەردگار رۆچون و، بێ گومان ئەم بارانەش ئێستاکە تەواوترن لە بارەکانی مرۆڤ.

ئیبنیلقەییم دەڵێ: بەم راڤە کردنەش؛ نهێنی پتر و باشتر بون و بەسەردا هەبون رون دەبێتەوە. بەڵگەکانی هەردو کۆمەڵیش رێك دەکەون و دەسازێن[1]. خوداش لە راستیەکان زاناترە



[1] ئەوی دەشیەوێ پتر لەم مەسەلەیە بتوێژێتەوە، با بگەرێتەوە بۆ (مجموع الفتاوى: ١١/٣٥٠) و بۆ (لوامع الأنوار: ٢/٣٦٨) و بۆ (شرح العقيدة الطحاوية/٣٣٨) .

# ژێدەرەکان


١. اغاثة اللهفان : لابن القيم

٢.البداية والنهاية : لابن كثير

٣. بصائر ذوي التمييز : للفيروز آبادي .

٤.تخريج أحاديث فضائل الشام: للشيخ ناصرالدين الالباني.

٥.تفسير ابن كثير.

٦. حجة الله البالغة : لولي الله الدهلوي.

٧. شرح العقيدة الطحاوية.

٨. سلسلة الأحاديث الصحيحة : للشيخ ناصرالدين الالباني.

٩.صحيح الجامع الصغير: لناصرالدين الالباني.

١٠. العقيدة في الله : للمؤلف

١١. لوامع الأنوار البهية (عقيدة السفاريني)

١٢. مجموع فتاوى ابن تيمية: جمع ابن قاسم.

١٣. معارج القبول : للشيخ حافظ الحكمي.

# فەرهەنگۆك

ئ

ئاتاج : پێویست ، چاو لەكۆمەك ، موحتاج

ئاژوان : لێخوڕین

ئاخاوتن : دوان . قسەكردن ، پەیڤین

ئافەریدگار : دروستكەر، وەدیهێنەر ، خوڵقێنەر، داهێنەر

ئافەریدە: دروستكراو، داهێنراو، وەدیهاتو، خوڵقاو

ئافەریدە كردن: دروستكردن، داهێنان، وەدیهێنان، خوڵقاندن

ئاكام : كاتی مەرگ، ئەجەل، پاشینە، دوایی

ئەسپایی: لەسەرخۆیی، هێواشی، هێمنی

ئەشكەنجە: ئازار

ئەفراندن: ئافەریدە كردن

ئەنگۆ: ئێوە، تۆو خەڵكی تر

ئەنگێزە: هەلایسێن، دنەدەر، هۆ ، مایەی سەرەكی

ئەمشۆ: ئەمشەو

ئەوانێهێ: ئەو چەند كەسەی دور

ئەوێهێ: ئەو كەسە دورە

ئێستێ: ئێستا

ب

بالاّ: بەرز ،پێچەوانەی نزم، بەژن

بالیۆز: سەفیر

بەتەنێ: بەتەنیا

بەرخوردار: كامڕەوا، مرادحاسڵ

بەقەستی: بەئەنقەست

بەلەز: بەتالوكە، خێرا ، بەپەلە

بوغزاندن: رقلێبونەوە

بولێڵ: تاریکی و ڕۆشنایی تێکەڵ لەئێواراندا، نێوان شەوو ڕۆژ.

بیانگ: بیانو، هەنجەت

بیرۆکە: فیکرە

بێژە : (لفظ)

بیم : ترس

پ

پاچڤان : وەرگێڕ، موتەرجیم

پاشماك : پاشماوە

پاکیگاری: تەسبیحات

پڕوپوچ: قسەوباسی بێماناو بێکاکڵ و ناڕاست، خورافات

پزدان: بێچودان، منداڵدان

پەرێشان: بێسەرەوبەرە، دڵ بەخەم

پەشۆکان: سەلێشێوان، شپرزەبون

پەلپ: بەهانە، بیانو

پەلەقاژێ: پەلەفرتێ، دەستولاق جولاندنەوە بۆ رزگاربون لەچۆرتم

پیتۆل: فەیلەسوف

ت

تالوکە: پەلە، لەز، عەجەلە

تەکوز: ڕێوپێك، لەبارو بێکەمایەسی

توخنکەوتن: چونەلا، لەگەڵ جوتبون

تۆم: تۆ ، ئاوی پیاو

ج

جوامێر: پیاوی چاك و مەرد

چ

چلۆن: چۆن

چم: چیم

چەلەنگ: شوخ و شونگ، چوست و ئازا

چەوتوچەوێڵ: خواروخێچ

چیچلە: نەرمایی گوێ

## ح

حسێبگەران: (حاسبین)

## خ

خانەوادە: بنەماڵە، تیرەو تایەفە

## د

دزێو: کرێت، ناحەز، ناشیرین

دەوزانی: دەتانزانی

دەیبیەن، دەیبیستن، گوێتان لێدەبێ.

## ر

راژە: خزمەت

راستینی: راستەقینە

راڤە: لێکدانەوە، تەفسیر

رژد: قرچۆك، چروك، بەخیل

رەگاژۆ: رەگداکوتاو، تەواو جێگیر

رۆچون: بەقوڵداچون و چەسپان

ڕۆژی بەرێ: رۆژی دوایی، قیامەت

ڕۆژی پەسلان: ڕۆژی بەرێ

روناهی: روناکی، روهنی، ( نور)

رۆنیشتن: دانیشتن

## ز

زلفیزی: دەعیە گەورەیی، لەخۆبایی بون، (کبر)

زەرو: زێرو، زالۆ، (علق) لێرە مەبەست کۆرپەڵەیە لەدۆخی (علقة)دا

ژ

ژنەوتن: بیستن، گویٚ لیٚبون

ژیوان: پەشیمان، تۆبەکار، گەڕاوە بۆ لای خوا ( منیب)

س

ستایش: پەسن، (حەمد)

سوپەر: چەپەر، سەنگەر، مەتاڵ

سیفەتە رەوشتیەکان: (الصفات الخُلُقیه)

سیفەتە سروشتیەکان: (الصفات الخَلقیه)

ش

شەیپور: کەڕەنا

شون: شویٚنەوار

ك

کو: چۆن

کۆڵەوار: حاڵ خراپ

کەرەنا: شەیپور، ( صور)

کەینیٚ: کەی ، چ کاتیٚك

گ

گازکردن: بانگکردن

گرواندن: دەرهیٚنانی لاشەگۆشت لەئەستۆڕا، لیٚرە بەمانای رۆح وەبەرداکردن هاتوە

گلمەت: کەستەك، کلۆگل، لیٚرە بەواتای بەردەشاخ (سجیل) بەکارهاتوە

گەشتیار: دنیاگەڕ، سەیاح

گۆتە: ئەوەی دەگوتری، (قول)

گۆلم: پڕی دەستیٚك

ل

لەبەریٚ: لەپیٚشدا

م

مالات: ولسات، ئاژەڵ

مرۆ: مرۆڤ، پیاو

مزگەفت: مزگەوت

مزگێنی: موژدە، هەواڵی خۆش

مشتاخ: جێگەی هەڵخستنی مێوە بۆ وشك بون

مشورگێڕ: ئاگاداری کار، (مدبر)

موشەك: سارۆخ

مێر: پیاو، شو، ئازا، دلاوا مەرد

ن

ناوبژیوان: کەوتنەبەینی دو دژ بۆ ئاشتکردنەوە

نشینگە: جێی‌نیشتەجێ‌بون، مەنزڵ

نەوی، نزم، پێچەوانەی بەرز

نوێژگە: جێگای نوێژ

ه

هاوردن: هێنان

هەڵبەزدابەز: بەرەوژور خۆحەوادان و هاتنەخوار

هەتەری: سور لەسەر مەبەست ، (حرص)

هەنگی: ئەو کات، ئەودەمی، ئەوسا

هێژا: زۆربەنرخ، بەرکەتی

و

وەشێرێ: بشارێتەوە

# رشتەی بابەتەکان